# ڕوونکردنەوەیەکی کورت
# لەسەر
# بەناو جەژنی میللەتی کورد

حوکمی جەژنی نەورۆز لەژێر ڕۆشنایی
قورئان و سونەت و وتەی زانایان


ئامادەکردنی

**هاوکار کوردی**

پێشەکی و پێداچونەوەی

م.عبدالحمید (کوڕی پاک)

# ڕوونکردنەوەیەکی کورت

# لەسەر

# بە ناو جەژنی میللەتی کورد

## حوکمی جەژنی نەورۆز

## لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان

ئامادەکردنی
هاوکارکوردی
پێشەکی و پێداچوونەوە
م.عبدالحمید ( کوڕی پاك )

**پێشکەشە بە**

**بە هەموو موسڵمانێك کە دەیەوێ هۆشیاری تەوحید و پەتی لا اله الا الله بێت و خۆی بپارێزێت لە شیرك و جۆرەکانی شیرك و هەڵگرانی شیرك و خۆ بەری کردن لێیان**

## پێشەکی مامۆستا عبدالحمید ( کوڕی پاك )

الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى اله واصحبه أجمعين أما بعد :

خوێنەری بەڕێز خودای پەروەردگار پەیمانی داوە ئەم دینەی بپارێزێت وەك دەفەرموویێت (انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون ) الحجر _9 وەهەروەها ئەرکی گەیاندنی ئەم دینەی بەلای خۆیەوە سبحانە هەڵگرتووە لە ڕێگای ناردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.تا ببێت بە بەڵگە بەسەر مرۆڤەکان.وە هەروەها گلەیی لە خودا نەکەن لەدوا ڕۆژدا.گوایە ئاگادار نەکرانەوەتەوە و ئەم مزگێنییەیی خودایان پێ نەگەیشتووە.پەروەردگار دەفەرموویێت (رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل وكان الله عزيزا حكيما ) النساء_165 بەڵام بەداخەوە لەم سەردەمە بێ پشت و پەنایەیی موسڵماناندا وە بە غوربەت بوونی دین و بێ ئاگاکردنی موسڵمانان لە زمانی عەرەبی و خۆش کردنی گڕی ئاگری نەتەوەیی و چاوەشەکردنی موسڵمانان بەبۆچوونی بریقەداری ئازادی و وەدەست هێنانی مافەکان خەڵکێکی زۆر دوورخراوەتەوە لەم ڕوناکیەیی کە لەلایەن خودای میهرەبانەوە دابەزیوە تا بەندەکان لە تاریکیەکان و هەورازە سەختەکانی ژیان قوتار بکات.بۆ ڕووناکی و بەختەوەری بێ ترس لە دونیا و دواڕۆژدا وەك ئەو ئایەتەی خودای پەروەردگار کە دەفەرموویێت (فاما يأتينكم منى هدى فمن تبع هداى فلا خوف عليهم ولاهم يحزنون)البقرة_38 دوای ئەوەی میللەتی کورد کەوتە دوای ئەم فێڵبازانەی کە کوردیان ئەمڕۆ بەم دەردە بردووە و لە دونیایان کردووە.خەڵکێکی زۆریشیان لە دواڕۆژیش کرد.بە هەڵخەڵەتاندنیان بە مێژووی ساختە و لێ سوڕانەوە و پێچاو پێچ کردنی ئایەتەکانی خودا و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.وە کاڵ کردنەوەی لە ( وەلا و بەڕا )ی میللەتی کورد و بێ هۆش کردنی ئێستا کاتی بێ ئاگایی و غەفلەتی میللەت و هاتنەبەرهەمی بێ ئاگایەکەیەتی.بۆیە ناحەزانی ئەم دینە ڕاوچیە فێڵبازەکان بەچەندین دیاردە و ڕەفتاری جۆراو جۆر لەبەرگی هەمەڕەنگدا خۆیان نیشان دەدەن وەك دەستگرێکی میللەت بۆ مەملەکەتی ئاشتی و قوتاربووندا هەرچی بیرەوەری و جەژنە کە پێشتر مولکی میللەتانی پێش هاتنی ئیسلام بەڵکو دیاردەیەکی باپەندبوونی میللەتان بووە بەئاینی تایبەتەوە و درووشمیان بووە.چوونکە هەموو میللەتێك و دینێك دروشمی تایبەتی خۆی هەیە.وەك پەروەردگار دەفەرموویێت (لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا )المائدة_48 واتە : هەموو میللەتێك پەیڕەو پرۆگرامی تایبەت بەخۆی هەیە.کەواتە موسڵمان

نابێت لەسایەی پەیڕەو و پرۆگرامی هیچ میللەتێکی تر بکاتەوە.بەڵکو پابەند دەبێت بە پێڕەو کردنی درووشمەکانی خۆی,وە پابەندبوون بەدرووشم واتە : داچوون و قوڵبونەوەی تاکە.لە میللەتەکە یاخود لە دینەکە.بۆیە خودای میهرەبان دەفەرمووێت (ذالك ومن يعظم شعائرالله فانها من تقوى القلوب )الحج_32 بۆیە یادەوەری درووشمە وە موسڵمانان جەژنی ڕەمەزان و قوربانن بە پیرۆز ڕادەگرێت و یادی دەکات.چوونکە لەدوای ئەنجامدانی بەندایەتی پێویست بۆ خودای میهرەبانەوە ئەم یادەوەریانە ئەنجام دەدرێن.یادەوەریش واتە ( عيد ) واتە : جەژن.بۆیە موسڵمانانێکی زۆر کەوتوونەتە ئەم سەرگەردانیە بەناوی قەومیەت و جەژنی میللەتی کورد ( جەژنی نەورۆز ) ئەم جەژنە لە ڕێزمانی دارشتنی ئەم دوو وشەیە کوردیە واتە کورد ناڵێ : نوێ..ڕۆژ بەڵکو ڕۆژی نوێ.وە نەلەزمانەوانی کوردی کورد بە ڕۆژ ناڵێت ( نو ) بەڵکو ( نوێ) بۆیە بۆزیاتر ئاشنابوون بەبابەتی نەورۆز ئاموژگاری موسڵمانان دەکەم ئەم ( نامیلکەیە ) پیرۆزە لە باوەشی تێگەیشتن و مەعریفەتانەدا بگرن.بەهەرحاڵ خودا چۆن پەیمانی داوە ئیقامە حوججە بەسەر بەندەکانی خۆی بکات.بەگەیاندنی ئەم دینەوە.چەسپاندنی ئایەتەکان و فەرموودەکان و واتەکانیان بەگوێی بەندەکاندا.خودای میهرەبان خاوەنی ئەم نامیلکە پیرۆزەی ( کاکە هاوکار کوردی ) دەستبەسەرکرد بۆ بەڵگەکردن و بەسەربەندەکانی لەدوارۆژدا کەسێك نەیەت بڵێت : خودایە نەم زانی هەڵخەڵەتام.

بۆیە داوا دەکەم لە موسڵمانان کە بەوردی و دیقەت بدەنە هەموو پیتێکی ئەم نامیلکەیە تا ڕاست و درووستی بابەتەکە بزانن.ئەم یادەوەریە تا چەند لە ئیسلامدا جێگای دەبێتەوە و ڕێگا پێدراوە و تا چەند یادەوەرێك و جەژنی میللەتی کوردە.یاخود تاوانی چیە ئەگەر موسڵمانێك بەژداری بکات لەم یادەوەریە...داواکارم لە الله سبحانە.خاوەنی ئەم نوسراوە ( ڕوونکردنەوەیەکی کورت لەسەر بەناو جەژنی میللەتی کورد ) بەهەموو پیتێك لەتاوەنەکانی خۆش ببێت و پلە و پایەی بەرزبکات و بیپارێزێت و بیخاتە تێشووی دوارۆژیان..امین

براتان:

عبدالحميد تاهیر ناسراو بە ( کوڕی پاك ) پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی ( صلاح الدين ) لە برادفۆرد_بەریتانیا

ڕێکەوت : 27_6_1439کۆچی بەرامبەر 14_3_2018میلادی

## پێشەکی نووسەر

## بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

الحمدلله,والصلاة والسلام علي رسول الله وعلي اله وصحبه ومن ولاه اما بعد :

**خۆشەویستانم..ئەوەی لەم نامیلکەم ئامادەکردووە تەنها ڕوونکردنەوەیەکی کورت و پوختە,بەزمانی شیرینی کوردی خۆشەویست,بۆ ئێوەی خۆشەویست و لە دڵاشیرین,لەژێر ناونیشانی﴿ڕوونکردنەوەیەکی کورت لەسەر بەناو جەژنی میللەتی کورد ﴾بۆ ئاگاداربوون لە بابەتێکی گرنگ,کە پەیوەستە بە ژەنگێکی ترسناك لەسەر بیروباوڕی کوردی دڵ پاك و فێڵ لێکراو,ئەزیزانم شەیتان و سیفەت شەیتانان سەدان ڕێگە و بەرنامە دادەنێن بۆ ئەوەی تاکی موسڵمان بەرەو هەڵدێر و تاریکایی ببەن.هەر جارێ و بە بەزمێك.بۆیە بە پێویستی دەزانم کە وەك دڵسۆزێکی خوێن و گۆشت و زوبانی خۆتان هۆشیارتان بکەمەوە لە بابەتێکی ترسناك و گرنگ.ئەویش هاتنی بەناو جەژنێك کە دوورە لە سنوورەکانی پەروەردگار.ئەویش ( جەژنی نەورۆز )بۆیە گرینگە تیشکی بخەینە سەر چوونکە پەیوەندی بە بیروباوڕی موسڵمان دایە.لەوانەیە هەموو لایەك ئەم بۆنەیە بە شتێکی ئاسایی بزانێت بەڵام نازانێت پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە عەقیدی تاکی موسڵماندا هەیە.ئێمە دوو جۆر جەژنمان هەیە ( جەژنی ئاینی و جەژنی نا ئاینی )وە ئەوەش بزانن هەموو میللەتێك جەژنەکانیان بەسەر ئەم دووجۆرە دابەش دەبێت.یەهودی..مەسیحی..مەجوسی..هتد جەژنی ئاینی و نا ئاینیان هەیە وەك چۆن موسڵمان دوو جەژنی ئاینی هەیە کە ئەوانیش (ڕەمەزان و قوربان )دوو درووشمی پەروەردگارە کە دەبێ جێبەجێیان بکەین.بۆیەش یەهودی..مەسیحی..مەجوسی..جەژنی ئاینی خۆیان هەیە بەبەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم کە بە ئەبوبکری سدیقی فەرموو ( هەموو میللەتێك جەژنی تایبەت بەخۆیان هەیە ئەوەش جەژنی ئێمەیە (جەژنی قوربان )بۆیە جەژنی نەورۆزیش یەکێکە لە جەژنە ئاینیەکانی مەجوسیەت و ئاگرپەرستەکان.هیچ پەیوەندیەکی بە تاکی موسڵمانەوە نیە کە بەژداری تێدا بکات.چوونکە پێچەوانەیە لەگەڵ تەوحید و یەك خوا پەرستیت..جا ئەو کەسەی کە بەژداری بکات حوکمی چیە ؟ بەویستی پەوەردگار لەم نامیلکەیە تەواوی بەڵگەکان دەبینیت لە قورئان و سوونەت و وتەی پێشین لەسەر ئەو جەژنە و حوکمی ئەو کەسەی کە بەژداری ئەم جەژنە دەکات چیە.وە لێکۆلینەوەیەکی زانستی و کورتم لەسەر مێژووی ئەم جەژنە نووسیوە و هەموو ئەفسانە و چیرۆکە**

بێ بنەماكانیم باس كردووە بۆ ئەووەی تاكی موسڵمان هۆشیاربێت لەو شتانەی كە لەدەورووپشتیدا ڕوودەدات.

لەكۆتایدا ...داواكرام لە پەروەردگار ئەم كارەم لێ وەرگرێ و بیخاتە تەرازووی چاكەكانم و من و گشت خوشك و برایانم لە خزمەت پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان  پیاوچاكان لە بەهەشتە پان و بەرینەكی كۆمان بكاتەوە..ئامین یارەب

برای موحتاجتان بە نزای خێر

**هاوكاركوردی**

ڕێكەوتی : 15_5_جەمادی ئەوەل ساڵی : 1439 كۆچی

بەرامبەر بە : 1_2_ ساڵی :2018

## پێناسه و زاراوەی له زمانی عەرەبی

**له زمانی عەرەبی : وتراوه ( كل يوم فيه جمع ) واته : هەموو ڕۆژێك كه تێیدا كۆبنەوە.له ئیشتیقاقی ( عاد..يعود..عيدا ) هاتووه. واته : گەڕانەوە.كۆیەكەی ( جمعه : اعیاد )** [1]

**پێشەوا ( الأزهري** [2] **) دەفەرموویت : العيد عند العرب الوقت الذي يعود فيه الفرح والحزن** [3] **واته : جەژن لای عەرەب ئەو كاتەیه كه دەگەڕێتەوە بۆی هەموو ساڵێك جا دڵخۆشی بێت یان ناڕەحەتی.**

**پێشەوا ( ابن الأعرابي** [4] **) دەفەرموویت : سمى عيدا لأنه يعود كل سنة بفرح مجدد** [5] **واته : ناوی لێنراوه جەژن.لەبەر ئەوەی خۆشیەك هەموو ساڵێك نوێ دەبێتەوە.**

**له زاراوەی شەرع زانان : فهو اسم لما يعود من الاجتماع العام على وجه معتاد,عائد بعود السنة.أو بعود الشهر,أو الأسبوع,أو نحو ذالك** [6] **واته : ناوێكه دەگەڕێتەوە بۆ كۆبوونەیەكی گشتی,بەشێوەی دیاری كراو.دەگەڕێتەوە ئەو ڕۆژە بەگەڕانەوەی ساڵ یان بە گەڕانەوەی مانگ..یان به گەڕانەوەی هەفتە..یان وەك ئەوان.**

---

(1) معجم الوسيط_ص563
(2) ابو منصور محمد بن أحمد بن أزهر الهروي.عاش فى العصر العباسي.اللغوي.الشافعي.الفقيه ثم اللغوي.ولد بالهراة سنة 282ه_مقابل 895 م...وفاة370ه_مقابل 981م
(3) أعياد الكفار وموقف المسلم عنها_ص10
(4) ابو عبدالله محمد بن زياد بن الأعرابي الهاشمى الشافعي.الأديب اللغوي.ولد سنة 150ه.سنة وفاة231ه
(5) القاموس _ص 386...لسان العرب _ج9_ص461
(6) اقتضاء الصراط المستقيم لابن تيمية_ج1_ص 496

**چەمك و زاراوەی نەورۆز لە زاراوەیەكی ( پەهلەوی كۆن_ ) وەرگیراوە.كە ( نوروز )ە.زاراوەكەش لە دوو برگە پێكهاتووە ( نو ) واتە : نوێ.وە ( روز ) واتە : ڕۆژ.هەردووكی واتە ( ڕۆژی نوێ ) [7] لە زمانی (پەهلەوی كۆنیشدا ) بە ( نۆكرۆج ) كە هەمان مانای بەخشیوە.( ئەبو نواس )یش.كە شاعیرێكی سەدەی دووهەمی كۆچیە لەسەردەمی عەباسیەكان.بەرامبەر بە سەدەی هەشتی میلادی ژیاوە ووشەی ( النكروز )ی لە شیعرەكانی بەكار هێناوە.**[8]

**هەروەها پێشەوا (** ابن قدامة [9]**) ش بەڕەحمەت بێت.ئەم وشەی لە كتێبی (** البدء والتاريخ **)ئەم وشەی زۆر بەكار هێناوە.**

**(** عبدالكريم رضايي **)ش كە توێژینەوەیەكی لەسەر نەورۆز ئامادەكردووە.بە ( نۆكرۆج ) دەری بڕیوە** [10] **هەمان زاراوە لە فەرهەنگی زمانی فارسی و كوردیدا بەهەمان واتا هاتووە ( ڕۆژی نوێ )كەواتە نە فارسیە نەكوردیە.بەڵكو زاراوەیەكی ( ئێرانی كۆنە ) چۆتە نێو هەردوو زمانی فارسی و كوردیەوە.ئەم جەژنە تەنها فارس و كورد نایگێڕن بەڵكو لە زۆربەی ناوچەكانی ئاسیا یادی ئەم جەژنە دەكەن وەك : وڵاتەكانی : ئێران و ئەفغانستان و ئازەر بایجان و تاجیكستان و كازاغستان و قرقیزستان و توركیا و توركمستان و لوبنان و ئەسیوبیا و میسر. وەلای زەردەشتیەكان هیندستان بە ( جەژنی ئافروزی پەتیتی )هاتووە.كە مەبەست لە ( پەتیتی ) واتای ( تەوبەكردن )بووە.وە نەورۆز لای لوبنانیەكان بە ( جەژنی نیریز )هاتووە.وە لە وڵاتی میسڕ بە ( نەورۆز ) هاتووە.وەلای قیبتیەكانی میسڕ و ئەسیوبییەكان بە ( جەژنی شەهیدان ) ناسراوە** [11]

## كەی نەورۆز كرا بەجەژنێكی نەتەوەیی جیهانی؟

**لە ڕۆژی 30 ی ئەیلولی 2009لەلایەن ڕێكخراوی یونیسكۆ كە ڕێكخراوێكی بەناو زانست و فێركردنە سەر بەنەتەوە یەككرتووەكانە كرا بە جەژنێكی جیهانی.**

---

(7) المعجم الموسوعي للمصطلحات_ص 320
(8) لسان العرب لابن منظور_باب : نرز_ص356
(9) موفق الدين أبو محمد بن أحمد بن قدامة بن مقدام.العدوي,القرشي,المقدسي,الجماعيلي,ثم الدمشقي,الصالحي,الحنبلي.ولد فی نابلس سنة 541ه...سنة وفات 620 فی دمشق
(10) تاريخ الموصل _ص 123
(11) الأثار الباقية عن القرون الخالية_ص432

**کاتێك دەمانەوێت سەرەتاکانی مێژووی سەرهەڵدانی جەژنەکە دیاری بکەین دەکەوینە نێو چەندین سەرچاوە و بیروڕای جیاواز لەسەری.کە زۆربەیان لە ئەفسانە کۆنەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە.ساغکردنەوە و ڕاستی و ناڕاستی ئەم ڕووداوە و ئەفسانانەش.دەیان کتێب و لێکۆڵینەوەی پێویستە.تا بتوانیت ڕاستی و ناڕاستی ئەم جەژنە جیابکەیتەوە.سەرەتا ئەوە بزانە بەوپێیەی ( نەورۆز ) وەك سەرەتای ڕۆژ و یەکەم مانگ و وەرزی ساڵ سەیرکراوە و مێژووی بۆ بیروباوەڕەکان درووست کردووە.هەر لەبەر ئەوەیە سەرەنجی هونەر و نووسەر و مێژوونووسان و چەندین خەڵکی تری بۆخۆی ڕاکێشاوە.تا ئەوەی زۆرترین شیعر و سروود و پەخشان بۆ ئەم جەژنە بنووسرێت و بگوترێت** [12]

**لە ڕووی مێژووییەوە باس لەوە کراوە کە یەکەمین کەس یادی جەژنە نەورۆزی کردۆتەوە ( جەمشید )ی دامەزرێنەری دەوڵەتی پیشدادیەکان.بووە.**[13] **خودی ئەو پادشایەش لای عەرەب بە ( مەتوشلخ ) هاتووە** [14] **گوایە ئەوەش کوڕی پێغەمبەر ( ئیدریس ) بووە** [15]

**بەڵام گەربچین سەیری تۆمارەکانی مێژوو بکەین ( مەتوشلخ )لەسەردەمی سۆمەریەکان ژیاوە لەسەر خاکی عێراقی ئێستا نەوەك وڵاتی ئێرانی کۆن** [16] **هەروەك لە مێژوو هاتووە کە پێغەمبەر ( ئیدریس و نوح ) خەڵکی شاری ( پور ) ی سۆمەرییەکان بوون.**

**زانایانی ئیسلامی جگە لە ( ئیبن قوتەیبە ) و ( مەقریزی ) ئەم جەژنەیان پاڵ داوەتە لای فارسەکان..( بەدلیسی ) کە کەسایەتێکی ملا و مێژوونووسی کورد بووە.ئەم جەژنە دەداتە پاڵ ( کوردەکان )**

---

(12)ديوان أبو تمام

(13)نشوار المحاضرة وأخبار المذاكرة _ص 136

(14)تاريخ غرر ملوك فرس_ص385

(15) التبيان والتبين.د.درويش جودي_ص 122

(16) المحاسن والأضداد_ص 21

**هەروەها بەر لەوەی ئەم جەژنە بە ڕووداوێکی ئەفسانەییەوە ببەسترێتەوە.کە ( کاوەی ئاسنگەر )ە.سۆمەرییەکان وەك یەکێك لە کۆنترین کۆمەڵانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و میسۆپۆتامیا بەر لە سێ هەزار ساڵ پێش میلاد و بابلیەکانیش بەر لە دوو هەزار ساڵ پێش میلاد.یادی ئەم جەژنەیان کردۆتەوە.جەژنەکەشیان بە ڕۆژی دار و درەخت و سەوزایی و دابارینی بەخشندەیی پەروەردگار لە ئاسمانەوە بۆ بەندەکانی لەسەر زەوی زانیووە.واتە ئەو شیکردنەوەیان بۆ نەورۆز کردووە.کە خودا لەیەکەمین ڕۆژی ساڵدا بەرەکەت و خۆشی بەسەر بەندەکانی دەبارێنی.بۆیە لەم ڕۆژەدا دڵخۆش بوون و دەم بەخەندە و ڕوو خۆش بوونە,وە پۆشاکی جوانیان لەبەرکردووە.ئاهەنگ و شاییان لەم ڕۆژە گێڕاوە.ئەوە بیروباوڕی سۆمەریەکان و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی بووە بۆ ئەم جەژنە.بۆیە ئێستاش وە بۆنەیەکی ئاییني یادی ئەم جەژنە دەکەنەوە.**

**وە لەگەڵ دەرکەوتنی ئاییني زەردەشتی یادی ئەم جەژنە وەك بۆنەیەکی ئاییني کراوەتەوە و بڕوایان وابووە.کە ئەو جەژنە هۆکاری گوڕینی دونایی مادییە بۆ دونیای هەتا هەتایی** [17]
**بەم شێوەیەش دەرکەوتنی ئایینەکە بۆ ( زەردەشتی کوڕی پورشاسپ ) دەگەرێتەوە.کە بەپێی سەرچاوە باوڕپێکراوەکان بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش میلاد دەگەڕێتەوە** [18] **بۆیە لەو سەردەمە جەژنەکە بەو باوڕە ئایينییە بەسەرەتای دەرکەوتنی بەخششەکانی پەروەردگار بۆ بەندەکانی و کۆتایی لێپێچینەوەش لەهەڵە و کەم و کوڕییەکانی ساڵی ڕابردوو ناسراوە.یان دەوترێت ( زەردەشت ) لەم ڕۆژە لەدایك بووە.دەرکەوتنی ئەو ئایینەش لە سنووری قەڵەمڕەوی ( دەوڵەتی ماد ) بووە.**[19]

(17)المصباح المنير لابن قتيبة_ج2_ص321
(18) المعارف_ص 11
(19) البداية والنهاية لابن كثير_ج2_ص231

بۆیە ماددەکانیش ئەم بۆنەیان وەك جەژنێکی ئایینی لە چوارچێوەیەکی سیاسیدا کردۆتەوە و بایەخیان پێداوە.

دوای ( دەوڵەتی ماد )یش هەریەك لە دەوڵەتانی هەخامەشینی و ئەشکانی و بەدوایشدا ساسانییەکان نەورۆزیان وەك جەژنێکی گەورە سەیرکردووە و ساڵانە لەپاڵ ( میهرەکان )دا یادیان کردۆتەوە.لەم بوارەدا ساسانیەکان لەو جەژنەدا باج و دیاری بەنرخیان پێشکەشی پادشاکانی ساسانی کردووە و بۆ ماوەی شەش ڕۆژ ئاهەنگیان بۆ گێڕاوە لەو جەژنەشدا پادشاکانی ساسانی تاجیان کردۆتە سەر و ئاڵوگۆڕیان بە پۆستەکانی دەوڵەت کردووە و سکەی پارەی نوێیان لێداوە و ئاتەشکەدەکانیان پاککردۆتەوە.[20] تەنانەت لەگەڵ یەکەم هاتنی ڕۆژی جەژنەکەش خۆیان شووشتووە و خۆیان پاك کردۆتەوە.

( خەسرەو پەروێزی ساسانی )ش.کە لە نێوان ساڵانی ( 590_628 میلادی )دا فەرمان ڕەوایی کردووە.لەگەڵ هاتنی جەژنی نەورۆزدا بۆ ماوەی دوو هەفتە دەچووە باخەکەی بەخۆشی و بەزم و شایی لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکەی و میوانەکانی و گەورە و دەسەڵاتدارانی ناوچەکەی بەسەربردووە [21] لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی ساسانیش لە ساڵی ( 641 م ) و دەرکەوتنی دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی یادکردنەوەی ئەو جەژنە ڕووی لە خاوبوونەوە بوو.لەبەر ئەوەی مەنهەجی خیلافەت ڕزگارکردنی خەڵك بوو لە شیرك و خورافیات و گومڕایی بۆ تەوحید و یەك خوا پەرستی.

---

(20) البدء والتاريخ_ج 3_ص123

(21) الخطط المقريزية المسماة بالمواعظ والاعتبار بذكر الخطط والأثار_ص 352

ئەوەش لەبیرنەکەین کە باس کراوە لە مێژوو ( سوڵتان مەلکشالی سەلجوقی )ش یەکەمین دەسەڵاتداری سیاسی بوو لە ساڵی ( 647 ك_بەرامبەر بە_1074 م )کۆمەڵەیەکی وەك لێژنەیەك پێکهێنا کە پێك هاتبوو لە ( عومەری خەیام و عبدالکریم الخازنی و موزەفەر ئەلئەسفزازی ) بۆ چاك کردنی ساڵنامەی ئێرانی.دیاربوو مانگی ( فەروەردین ) یەکەم ڕۆژی ئەو مانگەشی بە ( نەورۆز )وەك سەرەتای گوڕانکاری سرووشتی و سەرەتایی وەرزێکی نوێ دانا.کە دەکاتە ( بەهار )

ئەمەش کورتەیەکی پوخت و کورت بوو لەسەرهەڵدانی ئەم مێژووەی جەژنی نەورۆز کە لەپەڕەکانی مێژوو تۆمارکراون.هەرچەندە زۆرتر مابوو باسی بکەم بەڵام لەبەر کورتی کتێبەکە و کەمی کات بەوەندە کۆتایی پێدێنین. بەکورتی لەم چەند خاڵەش ئەم بیروباوڕانەی تریش کە باسکراون لەسەرهەڵدانی ئەم جەژنە باسی لێوە دەکەین لەچەند خاڵێك :

**یەکەم** : هەندێك پێیان وایە سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ( **جەمشید** ) پاشا,کە لەسەردەمی پێغەمبەر هود سڵاوی خوای لەسەر,بووە,دوای ئەوەی ئایین گۆڕانکاری بەسەرهات,زوڵم و زۆرداریيەکی زۆر هەبوو,کە پاشاکەی پێش ئەو ئەنجامی دابوو,ناوی پاشاکە ( **تەهومرت** ) بوو,کاتێ جەمشید هاتە سەر تەخت,ئایینی گێڕایەوە شوێنی خۆیی و نوێی کردەوە,هەروەها دادپەروەردی بڵاوکردەوە,جا ئەو ڕۆژە کرا بە جەژن و ناونرا ( **نەورۆز** )

دوای ئەوەی جەمشید تەمەنی گەیشتە ( 700 )ساڵ,هیچ نەخۆشیەکی تووش نەبوو,ئەوەبوو گیرۆدەی لەخۆبایی بوون هات,ئینجا داوای کرد پەیکەرێك لەسەر شێوەی خۆی بۆ درووست بکرێت,پاشان ناردی بۆ پاشاکانی تر بۆ ئەوەی بەگەورەی بزانن و خەڵکە سادەکەش بیپەرستن,دیارە ئەمەی لێ قبوڵ نەکرا,بۆیە **زوحاکی عەلوانی** کە لەعەمالیقەکانی یەمەن بوو,جەمشیدی پاشای کوشت .

**دووهەم** : دەڵێن ڕۆژی نەورۆز ڕەمز و هێمای ئاینی زەردەشتیە گوایە زەردەشت بۆ کوردان هاتووە وە ئاگر پەرستیش بووە بویە نەورۆز وەك جەژنێکی نەتەوەیی و ئایینی هەڵبژاردووە بۆ کورد وە بۆیەش لەم ڕۆژە ئاگریان کردۆتەوە .

**سێهەم** : دەڵێن پادشایەك هەبووە بە ناوی **سرجون** کە نازناوی **زووحاك** بووە,ئەو پادشایە زۆر ستەم کار بووە هەموو ڕۆژێك ژمارەیەك گەنجی دەهێنا و سەری دەبڕین لە پێناو ئەوەی شیفای بۆ نەخوشیەکەی بێت,ئەم کارەی دەکرد بە ڕێنمایی پزیشکەکانی بوو,جا یەکێك بەناوی **کاوە** کە ئاسنگر بوو هەڵدەستێت شۆڕشێك دژ بەم ستەم کارە دەکات بە یارمەتی کۆمەڵێ گەنجی بەهێز دوای لەناو بردنی ئاگر دەکاتەوە لەسەر چەند چیا و دۆڵێك,جا ئەم ڕۆژە لە سەرەتای بە هار بووە .

**چوارەم** : پاشایەك هەبووە بەناوی ( **جەمشیدی کوڕی تەهمۆرس** ) کە یەکێك بووە لە پاشایە کۆنەکانی فارس,دەڵێن : ئەوەی بۆ ئەم پاشایە فەراهەم و گوێڕایەڵ بووە,بۆ هیچ پاشایەك نەبووە لە پێش

ئەودا,تەختێكی هەبووە لەسەری دادەنیشت كە ڕازاندرابۆەوە بە یاقوت و هەرجان,بە هەموو لایەكی زەوی دەسوڕایەوە,هەركات ویستبای ئەم تەختە دەفڕی بەهۆی جنۆكەكانەوە,گوایە جنۆكی لەژێر فەرمانی ئەودا بوونە,لەیەكەم ڕۆژی ساڵ كەلە ( 21 )ی ئازاردا,سەردانی هەموو پاشاكانی دەكرد,جا خەڵكی خۆشی و شادیان دەنواند لەم ڕۆژەدا,بۆیە ئەم ڕۆژە بە پیرۆز دانراوە لای فارسەكان,وەك داب و نەریتێكی نەتەوەیی سەیری دەكەن .

**پێنجەم** : زوحاك كە دواین پاشای دەوڵەتی ( **ماد** ) ی كوردی بووە,گوایە دووماری لەسەر شانی بووە,كە بۆ خواردنی ڕۆژانەیان پێویست بوو گەنجێكی وڵات بكوژرێ و مێشكەكەی دەرخواردی ئەم مارانە بدات,دەڵێن : زووحاك پاشایەكی زاڵم و بێ بەزەیی و دڵڕەق بووە,پاش ئەوەی مێشكی یازدە لە منداڵانی كاوەی ئاسنگەر دەدرێتە ئەم مارانە بۆ جاری دوازدەهەم و دواین منداڵی,كاوە دەچێ مێشكی مەڕێك دەردێنێ و لە دەفرێكدا بۆ پاشای دەنێرێ و لە جیاتی مێشكی مرۆڤ دەر خواردی مارەكان دەدرێ,خەڵكانێكی زۆر ئەم شێوەی كاوە ئەنجام دەدەن و ئەو گەنجانەی سەرنابڕێن بەرەو شاخ ڕەوانە دەكرێن و لە شار دوور دەكەونەوە تاكو نەبینرێنەوە [22] پاش ئەوەی خەڵك لەم زوڵم و زۆرداریەی ( زووحاك ) بێزار دەبن,بە سەركرایەتی كاوەی ئاسنگەر,كوتك لەسەر شان,بەرەو باراگەی زووحاك دەكەونە ڕێ و لەسەر دەستی كاوە دەكوژرێت,دیارە لە بەهار دەبێت و لە ڕۆژی (21 ) دەبێت,بۆیە دەیانكردە جەژن .

**شەشەم** : ئەم ڕۆژە یەكەم ڕۆژە لە ساڵنامەی قیبتیەكان,كەبە ( **شم النسیم** ) ناسراوە واتە : بۆن كردنی هەوای خۆش .

دەڵێن : سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش زایین,واتە : پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ( ماد ) بەچەند هەزار ساڵێك,نەوروز سەرەتا بە ناوی ( **شم النسیم** ) ناسراو بوو,بنچینەی ئەم وشەیە ( **شمو** ) ی فیرعەونیە,( شمو ) ش وشەیەكی هێرۆگلیفیە و لەلای دێرینەكان ئاماژەی پێدەكرێت بۆ سەرەتای درووست بوونی ژیان,چونكە لەو باوڕە دابوون ئەو ڕۆژە یەكەم ڕۆژی دەست پێكردن و هاتنە بوونی جیهانە,واتە یەكەم ڕۆژێكە ژیانی دونیا تیایدا دەستی پێكردووە,وە پێی دەوترا جەژنی ( شموس ) واتە : زیندووبوونەوەی ژیان,بەڵام لەگەڵ بەسەرچوونی ساڵ و لەسەردەمی ( قیبتیەكان ) ناوەكە گۆڕا بۆ ناوی ( شەم ) پاشان وشەی ( شم ) ی بۆ زیادكراو بوو بە ( شم النسیم ),چونكە پەیوەست بوو بە خۆش بوونی كەش و هەوا,لەو ڕۆژەوە كە سەرەتای بەهارە,وەك : لەسەرەتادا ئەم جەژنە لای فیرعەونیەكان باو بووە,هەر لەوانیشەوە گوازراوەتەوە بۆ میللەتانی تر .

---

( 22 ) مێژوونووسان دەڵێن : كورد لەو كەسانە درووست بوونە كە ئاوا لە شاخەكان بووە

**حەوتەم** : هەندێکی تر دەڵێن : ئەم ڕۆژە سەرەتای دروستبوونی ڕۆژ و ڕووناکی لەم ڕۆژەوە بووە,بۆیە ئەم ڕۆژە کراوەتە بۆنە و جەژن واتا : سەرەتای ڕۆژ .

**هەشتەم** : دەڵێن : ئەم ڕۆژە سەرەتای ساڵی کوردییە,چونکە لەو ڕۆژەدا ( ماد )ە کان بەسەر ئاشوورییەکاندا سەرکەوتن,پاشان مێژووی کوردی دوای ئەم سەرکەوتنە درووست بوو .

**نۆهەم** : دەڵێن : هاوکاتە لەگەڵ نوێ بوونەوەی سرووشت و سەوزبوونی گژوگیا,پەیوەندی بە هیچی ترەوە نییە.

درووست بوونی ئەم هەموو مێژووە سەیر و سەمەرەی میللەتەکان لەسەر ئەم جەژنە ئەوەیە کە بە هوی نزیکی شوێنی جوگرافیایی ناو چەکەیە لە یەکتری,جا هەر یەکە و تەفسیرێك بۆئەم ڕووداوانە دەکات [23]

**کەوابوو** : کێشەیەکی زۆر هەیە هەم لە ڕووی مێژووەکەی ئایا کەی سەری هەڵداوە ؟ هەم لە ڕووی سەرهەڵدانەکەی ئایا هۆکارەکەی چیبووە ؟

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم ڕۆژە جەژنی ئاگرپەرستەکان بووە,چوونکە شوێنەواری ئاگرپەرستەکانی پێوە دیارە,لە پاشان ئەم ڕاستیە لە ڕێگەی بەڵگەکان ڕوون دەکەینەوە,هەروەها کوردیش پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆربەیان ئاگر پەرست بووە,هەر بۆیە ئێستاش کورد ناوی خوای گەورە بە ( یەزدان ) دەبات,کەچی لەڕاستیدا یەزدان ناوی خوای ئاگر پەرستان بووە,چوونکە ئاگر پەرستان دوو خوایان هەبووە, خوای خێر و خوای شەڕ,یان خوای ڕووناکی و خوای تاریکی,یان خوای ڕۆژ و خوای شەو,لای ئەوان خوای خێر ناوی ( یەزدان ) بووە,وە خوای شەڕ ناوی ( هورمزان ) بووە,هەروەك مێژوونووسان فەرموویانە .

---

( 23 ) بۆ زانینی تەواوی بۆچوونەکان لەسەر پەیدابوونی جەژنی نەورۆز سەیری پەرتووکی : ( البدع الحولية ) لە دانەری شێخ عبداللەی کوڕی عبدالعزیز ی کوڕی تویجری لە بابی ( لاحتفال ) لاپەڕە _ 389 من تەنها ( هەشت ) خاڵم باس کردووە لەبەر درێژ نەبوونەوەی بابەتەکە

**دەبینین وشەی ( نوروز ) ئاوێتە و لێکدراوی دوو وشەیە,وشەی ( نو ) واتە : نوێ, وە وشەی ( روز ) واتە : ڕۆژ  کەواتە واتای تەواوی : ڕۆژێکی نوێ,لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت بەپێی زمانەوانیدا کورد بەژدارە لەم ڕۆژە ..**

**بەڕاستی فارسەکان کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر داب و نەریت و زوبان و کلتوری کوردی,نەوەك تەنها کورد,بەڵکو بگرە کاریگەریان لەسەر زۆربەی نەتەوەکانی دراوسێی هەبووە,وەك : ئەفغانی و تاجیکی و ئازەری و قیرقیزی و ئۆزبەکی و قزاق و ئەورائی و ئەوستیای و تورکی  و ...هتد بە تایبەت لە ناوچەکانی ئاسیادا .**

**ئێمەی کوردیش تەواو هەست بەم ڕاستیە دەکەین,کاتێك گوێ دەگرین لە فارس زوبانێك کە قسەدەکات هەمووی تێدەگەین .**

**ئەوەی لێرە مەبەستە ئەم جەژنە ئەگەر ئایینی بێت یان نەتەوەیی بێت یان داب و نەریت بێت یان لاسایی کردنەوە بێت,دەبێ بزانین حوکمی شەرعی چیە و چۆنە ؟**

## جۆرەکانی جەژن

**بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر جەژنمان هەیە :**

**یەکەم : ئایینی**

**دووهەم : نا ئایینی**

**یەکەم : جەژنی ئایینی : واتە : ئاین ئەم جەژنە دیاری دەکات ئەم جەژنە موسڵمان و کافر هەیانە چونکە هەموو نەتەوەیەك بە پێی ئاینیان خاوەن جەژنی خۆیانن هەروەك دایکمان عائشە لە پێغەمبەرگیانەوە صل الله علیه وسلم دەگێڕتەوە کە بە ابو بکری باوکی گووتووە**

يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا [24]

**واتە : ئەی ابو بکر بەڕاستی هەموو نەتەوەیەك جەژنی خۆیان هەیە ئەمەش جەژنی ئێمەیە مەبەستی جەژنی ( قوربان )بوو.**

**کەواتە : ئێمە وەك موسڵمان جەژنی خۆمان هەیە جولەکەش جەژنی خۆی هەیە و گاورەکانیش جەژنی خۆیان هەیە و ئاگر پەرەستەکانیش جەژنی خۆیان جا کەواتە هەر کەسەو دین و جەژنی خۆی,دینەکەی ئێمە ڕاست و حەقە و کەواتە : جەژنەکەشمان حەقە و ڕاستە,بەڵام جەژنی جولەکە و گاورەکان و ئاگر پەرستەکان و ئەوانی تر,لەسەر باتڵ و پوچن کەواتە : جەژنەکەشیان پوچ و باتڵە .**

**ئێمە وەك : موسڵمان دوو جەژنمان هەیە :**

**یەکەم : جەژنی ڕەمەزان**

**دووهەم : جەژنی قوربان**

---

( 24) صحيح مسلم برقم : 892

## جەژنی بێ باوڕەکان

**گاورەکان و فەلەکان ( النصرى ) :**

**ئەوانیش وەك : دین چەند جەژنێکیان هەیە وەك :**

**یەکەم : ( عید المیلاد ) واتە : جەژنی لەدیك بوون.**

**_ جەژنی لەدایك بوونی عیسا کە لای مەسیحیەکان ناسراوە بە ( جەژنی کریسمس ) کە بەداخەوەم زۆربەی موسڵمانان تێی کەوتوون لەبەژداری کردنی...وەیان ئەوەش دەگلرێتەوە کە ئاهەنگ بگێڕیت بەهۆی ڕۆژی لەدایك بوونی خۆت یان منداڵەکان کە داخەکەم زۆرینەی خەڵك تێی کەوتوون.**

**دووهەم : (**عید الفصح أو القیامة **) واتە : جەژنی لێخۆشبوون یان قیامەت.**

**_ عەقیدەی گاورەکان وایە کە عیسی مەرێکی سەربڕی لەگەڵ قوتابیەکانی وە لەو ڕۆژەدا دڵخۆش بووە.کەپاش سەرماو سۆڵەیەکی زۆر کەوتوونەتە نێو بەهار.لەورۆژەدا عیسا و قوتابیەکانی دڵخۆشبوون.کە لەڕۆژی پێنج شەمیش بووە.**

**سێهەم : (** عید البشارة **) واتە : جەژنی موژدەدەر.**

**_ بەهۆی ئەوەی کە جوبریل موژدەی عیسای بە دایە مەریەم دا.**

**چوارەم : (** عید الشعانین أو زیتونة **) بە عەرەبی پێی دەڵێن ( عید التسبیح ) واتە : جەژنی زیکرکردن یان پێیان وتووە جەژنی زەیتوون.**

**_ پاش ئەوە هاتووە کە پاش حەوت ڕۆژ بەڕۆژووبوون لەڕۆژی یەك شەم.ئاهەنگیان گێڕاوە.وە دەچن بۆ کەنیسە و خورما دەبەخشنەوە.**

**پێنجەم : (** عید العنصرة **) واتە : کۆبوونەوە.**

**_ بە پەنجا ( 50 ) ڕۆژ لە دوای جەژنی ( قیامەت ) دێت.وە دەڵێن : ڕۆحی پیرۆز تێکەڵی لاشەی قوتابیەکانی پێغەمبەر عیسا بوونە و هەریەکە و بەلایەك ڕۆیشتووە و زمان و لەهجەی جیاوازیان درووست کردووە.**

**شەشەم : (عيد الغطاس ) واته : جەژنی شووشتن.**

**_ دەڵێن : پێغەمبەر یەحیای کوڕی زەکریا پێغەمبەر عیسای لە ڕووبارێك لە وڵاتی ئوردون شووشتووە.وە گاورەکانیش لەو ڕۆژەدا منداڵەکانی خۆیان بە ئاوی سارد دەشۆن.**

**حەوتەم : ( عيد خميس العهد ) واته : جەژنی ڕۆژی پێنج شەم.**

**_ لەوڕۆژەدا خۆیان بۆ پەروەردگار زەلیل دەکەن و نەفسیان دەشکێنن.**

**هەشتەم : (عيد التجلى ) واته : جەژنی ماڵئاوایی.**(25)

**_عیسا پێش ئەوەی بەرزبێتەوە بۆ ئاسمان وەسیەتی بۆ قوتابیەکانی دەکرد.وەسیەتەکەی لە ئینجیلە ڕاستەکان دوور و درێژە.**

(25) چەندین جەژنی تریان هەیە بەڵام لەبەر کورتی ئەوەندەم باس کردووە.بۆ زیاتر زانیاری جەژنەکانیان سەیری ( معجم اللاهوت_ص 609__التقاويم_ص_ 139)بکە.

**جولەکەکان:**

کە ئەوانیش خاوەنی چەندین جەژنن لەوانە :

**یەکەم** : جەژنی ( هیشا ) ئەم ڕۆژە لەلایان ڕۆژی فیدیەی قوربانی و سەربڕینی ئیسحاقی کوڕی پێغەمبەر ئیبراهیمە سەلامی کردگاریان لەسەر,گوایە سەربڕاوەکە ئیسحاق بووە نەوەك : ئیسماعیل,ئەم جەژنە زۆر پیرۆزە لایان وەکو چۆن جەژنی قوربان لای موسڵمانان پیرۆزە .

**دووهەم** : جەژنی ( صوماریا) یان (کیبوری) لەلایان ڕۆژی لێخۆشبوونە .

**سێهەم** : جەژنی سێبەر,لەم ڕۆژەدا خۆیان دەدەنە بەرسێبەری لقەکانی دار و درەخت .

**چوارەم** : جەژنی (الفتیر) کە بەبۆنەی هەڵاتنی بەنی ئیسرائیل لە میصر لە چەرخی سێزدەی پێش زاین,دیارە لەوکاتە بەنی ئیسرائیل نانیان خواردووە بێ ئەوەی نانەکەیان هەڵاتبێ و هەستابێت,ئێستاش ئەم جۆرە نانە دەخۆن لەم جەژنەدا .

**پێنجەم** : جەژنی (وتار) گوایە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسی کردووە .

**شەشەم** : جەژنی ( یوم المغفرة ) ڕۆژ لێخۆشبوون,یان تەوبەکردن,لە مانگی دەی ساڵی یەهودییە,کە خەڵکێك جیا دەبێتەوە نۆ ڕۆژان,تێدا عیبادەت دەکات و بەڕۆژوو دەبێت .

**حەوتەم** : جەژنی (هیلالی نوێ) هەموو هیلالێکی نوێ,ئاهەنگ دەگێڕن,فوو دەکەنە زۆڕناکان لە قودس و ئاگر دادەگیرسێنن لە خۆشیان .

**هەشتەم** : جەژنی (یوبیل) هەروەها چەندین جەژنی تریان هەیە .[26]

---

(26) بۆ زیاتری جەژنەکانیان سەیری سایتی (وای باك مشین ) بکە.

**ئاگر پەرەستەکان :**

**ئەوانیش چەند جۆرێکیان هەیە لەوانە :**

**یەکەم : جەژنی (نەورۆز) ماناکەی ئەم وشەیە ئاوێتە و لێکدراوە بە (نو) هەروەها (ڕۆژ) واتە :ڕۆژێکی نوێ .**

**دووهەم : جەژنی (میهرەجان) ماناکەی ئەم وشەیەش ئاوێتە و لێکدراوە بە (مهر) واتە : وەفا, هەروەها (جان) واتە دەسەڵات,کە ماناکەی بریتیە لە : دەسەڵاتی وەفادار .**

**وتراوە : ئەصڵی ئەم جەژنەش بریتیە لە خۆشی و دەربڕین بەهۆی سەرکەوتنی (ئەفریدون)بەسەر زوحاکی علوانی ئەوەی کە (جەمشید) ی کوشت** [27]

**دووهەم : جەژنی نا ئایینی :**

**مەبەستمان لەم جەژنانەیە کەلەڕێگەی داب و نەریت و لاسایی کردنەوە دیاری دەکرێت,نەك لە ڕێگەی ئایینەوە,ئەم جۆرە جەژنانە زۆرن ئێمە تەنها هەندێکیان باس دەکەین بەخاڵ :**

**یەکەم : جەژنی نیشتیمانی و نەتەوەیی,وەك : سەرکەوتنی قەومێك بەسەر دوژمنەکەی,یان جەژنی سەربەخۆیی وەرگرتن,یان جەژنی لەدایك بوونی سەرکردەی وڵاتێك .**

**دووهەم : جەژنی خۆشەویستی .**

**سێهەم : جەژنی خێزانداری .**

**چوارەم : جەژنی کرێکاران .**

**پێنجەم : جەژنی لە دایك بوون .**

**شەشەم : جەژنی منداڵان .**

**حەوتەم : جەژنی دایك .**

**هەشتەم : جەژنی ئافرەتان .....هتد**

## جەژنی نەورۆز لە ڕوانگەی قورئان و سوننەت و ووتەی زانایان

ئەوەی ڕاستی بێت ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەنها دوو جەژنی بۆ ئێمە داناوە ئەویش : جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە,نابێت جگە لەم دووانە بە جەژنی دابنێین چونکە جەژن لە ئیسلامدا بە واتای :پەرەستن دێت کە بریتیە لە : شوکرانە و تەکبیر لێدان بۆ خوای گەورە, جا دەمەوێت بە پشتیوانی خودا لە ڕوانگەی قورئان و سوننەت و وتەی زانایان نا درووستی ئەم جەژنە ڕوون بکەمەوە .

**بەڵگەی : یەکەم**

**پەروەردگار دەفرموویێت (** وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَنْ يُعَمَّرَ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ **)** البقرة :٩٦

**واتە : ئەی محمد سوێند بەخوا ,تۆ دەبینی کە جولەکە لەهەڵپە بۆ ژیانی ئەم دونیایە و لەهەموو کەس بەئاوات ترن بۆ ژیان ,بگرە لەو کەسانەش زیاتر کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن,سوورتر و تامەزرۆترن,کەوابو درۆ ئەکەن کە دەڵێن : ئێمە گەلێکی کەم ویست و تەماعین,هەر کام لەوانە ئاواتە خوازە و پێی خۆشە کە هەزار ساڵ تەمەنی هەبێ و بژی,خۆ ئەگەر ئەو تەمەن درێژەشی بدرێتێ,کاتێ مرد و گەڕایەوە لای خوا,بەو تەمەنە درێژەی لە سزای خوا دوور ناخرێتەوە و ڕزگار نابێ وە خواش بەو کار و کردەوەی ئەوان دەیکەن زۆر بینایە,کەوابوو ئیتر ئێوە هەرگیز ناتوانن هیچ شتێکی لێ بشارنەوە درۆی لەگەڵدا بکەن .**

**کاتی خۆی نەورۆز باو بووە لە لای ئاگر پەرەستەکان لە کاتی پیرۆزبایی کردن,بەیەکتریان دەگوت : هەزار ساڵ بژیت نەك هەر لەجەژن بەڵکو لەکاتی پژمین و سڵاوکردن و میهرجانەکانیانیش**

**ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیرۆزبایی کردن بەهەموو شێوەیەك نا درووستە بەبۆنەی ئەم جەژنەوە .**

**ڕاو بۆچوونی ڕاڤەکارانی قورئان لەسەر ئەم ئایەتە :**

**یەکەم : پێشەوا(** ابن كثير**)**, 774ھ**,دەفەرموویێت : لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا,دەگێڕێتەوە لە باوکی حاتەم ئەویش لە عبداللە ی کوڕی عەباسەوە کە فەرموویەتی : مەبەست لە ئایەتی (**وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ...**) ئاگر پەرستە مەجوسەکانە**[27]

**کە دیارە ئاگر پەرست و مەجوسیەکانیش فارسەکان بوون .**

(27) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير ص80

**دووهەم** : **پێشەوا سەمەرقەندی,373ھ,دەفرموویێت** : قوله تعالی ( يَوَدُّ أَحَدُهُمْ ) يعني المجوس يقولون لملوكهم في تحيتهم: عش عشرة آلاف سنة وكل ألف نيروز (28)

**واتە : مەبەست لە وتەی پەروەردگار ( يَوَدُّ أَحَدُهُمْ ) واتە :ئاگرپەرستەکان کاتی خۆی دەیان وتە پادشاکانیان وەك سڵاو : هەزار ساڵ بژیت,وە هەموو ساڵێکت هەر نەورۆز بێت .**

**سێهەم** : **پێشەوا (ثعلبي )427ھ,دەفرموویێت** :قولة تعالي ( ألف سَنَةٍ ) قال المفسّرون: هو تحيّة المجوس فيما بينهم عش ألف سنة وكلمة ألف نيروز ومهرجان.(29)

**واتە : مەبەست لە وتەی پەروەردگار ( أَلْفَ سَنَةٍ ) ڕاڤەکاران دەفەرموون : ئەوە سڵاوکردنی ئاگر پەرستەکانە,لە نێوان خۆیاندا,وە دەڵێن : هەزار ساڵ بژیت,وە وشەی : الف واتە : نەورۆز و میهرەجان**

---

(28) بحر العلوم ابو الليث السمرقندي,ج1 ص75

(29) الكشف والبيان عن تفسير القران,ج1 ص238 بتحقيق : ابن عاشور

**چوارەم : هەروەها پێشەوا (قرطبي ) ,671ھ,هەمان ڕاڤەی شێخی سەعلەبی و سەمەرقەندی هەیە** (30)

**پێنجەم : پێشەوا سەمعانی,489ھ,دەفەرموویێت :** وَالْمرَاد ب( الذين أشركوا) هَا هُنَا: الْمَجُوس وَذَلِكَ أَنهم يَقُول بَعضهم لبَعض: عش ألف سنة " زه هزار سال (31)

**واتە : مەبەست لەوتەی پەروەردگار ( الذين أشركوا ) لێرەدا : ئاگر پەرستەکانن لەبەر ئەوە لە نێوان خۆیاندا هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن : هەزار ساڵ بژیت,**

**شەشەم : پێشەوا بەغەوی,510ھ,دەفەرموویێت :**قولة تعالي ( أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ) يَعْنِي: تَعْمِيرَ أَلْفِ سَنَةٍ، وَهِيَ تَحِيَّةُ الْمَجُوسِ فِيمَا بَيْنَهُمْ، يَقُولُونَ: عِشْ أَلْفَ سَنَةٍ وَكُلُّ أَلْفِ نَيْرُوزٌ ومهرجان (32)

**واتە :وتەی پەروەردگار ( أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ) واتە :داواکردنی تەمەن درێژی,ئەوە سڵاوی ئاگرپەرستەکانە لە نێوان خۆیاندا کە دەڵێن : هەزار ساڵ بژیت,وە هەر هەزار ساڵێش نەورۆز و میهرەجان بێت**

**حەوتەم : پێشەوا ئیبن جەوزی,597ھ,دەفەرموویێت :**قوله تعالي (الَّذِينَ أَشْرَكُوا...) يعني: أنهم المجوس، قاله ابن عباس، وابن قتيبة والزجاج (33)

**واتە :مەبەست لە وتەی پەروەردگار (الَّذِينَ أَشْرَكُوا...) ئاگرپەرستەکانە,وەك : ئیبن عباس و ئیبن قتیبە و پێشەوا زەجاج وا دەفەرموون .**

---

(30) الجامع الأحكام القرأن,ج2 ص34
(31) تفسير القرأن,ابو مظفر السمعاني,ج1 ص111 بتحقيق : ابن غنيم
(32) معالم التنزيل في تفسير القرأن الكريم,ج1 ص144,بتحقيق : عبدالرزاق المهدي.
(33) زاد المسير في علم التفسير,ج1 ص89

**هەشتەم : هاوەڵی شەرع زان ئیبن عباس,68ھ,دەفەرموویت : قوله تعالي** ( لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ )يعني : أَن يعِيش ألف نيروز ومهرجان (34)

**واته : وتەی پەروەردگار تعالی** ( لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ )**واته : بژيت هەزار نەورۆز و ميهرەجان**

**نۆيەم : ئيمامی باوكی منصور ماتريدی,333ھ,دەفەرموويت** : وقوله: (وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ..)

يعني: المجوس.أي. هم أحرص الناس على حياة الدنيا من المجوس؛ لأَن المجوس لا يؤمنون بالبعث ولا بالقيامة،.(35)

**واته : مەبەست لە وتەی خوا واته : ئاگرپەرستەكان,چونكه ئەوان سورترن لەسەر ژيانی تاڵ و شرينی دونيا,لەبەر ئەوەی ئاگرپەرستەكان,برِوايان بە رِۆژی زيندوو بونەوە و رِۆژی دوای نيه**

(34) تنوير المقباس من تفسير ابن عباس,جمعه لامام :الفيروز ابادي,817ه,ج1 ص14
(35) تفسيرالماتريدي ( تأويلات أهل السنة ) لأبو منصورالماتريدي,ج1 ص514_515 بتحقيق : د.مجدي باسلوب

**خۆشەویستانم زانیمان ئەو موشریکانەی کە لەو ئایەتەدا هاتووە,مەبەست پێی : موشریکە ئاگر پەرستەکانن,کە غەیرە عەرەبن,نەوەك موشریکە عەرەبەکان,ئەم ئاگر پەرستانە,لە کاتی بژمین و سڵاوکردن,یان لەکاتی پیرۆزبایی کردن لە ڕۆژی جەژن و میهرەجاندا,بە یەکتریان دەوت : هەزار ساڵ بژیت,**

**هەروەك ڕاڤەی ڕاڤەکارانی قورئانمان هێناوە لەسەر واتای ئایەتەکە کە هەموویان کۆك بوون لەسەر یەك وشە ئەویش ( زە هزار سال ) لەوانە ئیبن عباسە کە هاوەڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئامۆزای و تەرجومانی قورئان فەرمووی :** "هو قول الاعاجم"هزار سال نوروز و مهرجان [36]

**واتە : ئەوە وتەی : عەجەمەکانە,هەزار ساڵ و نەورۆز و میهرەجان**

**هەروەها لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە فەرموویەتی : ( زە هزار سال )** [37]

**( زە ) و ( زی ) لە زوبانی فارسی لە ( زیستن ) هاتووە,کە بەمانی ژیان دێت,واتە : هەزار ساڵ بژیت,ئەوەش ئاوەتە خوازی دەگەیێنێ بۆ تەمەن درێژی .**

(36) تفسير ابن كثير,ج1 ص296
(37) تفسير الطبري,برقم : 1596,وصححه أحمد محمد شاكر

پوختەی قسە :

ئازیزانم.برا و خوشکانی یەك  خوا پەرستم,لێرەدا چەند شتێمان بۆ ڕوون دەبێتەوە :

یەکەم : بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە نەورۆز جەژنی موشریکانە,چونکە خوای گەورە دەفەرموویت : ( هەر یەکێکیان ئاواتی دەخواست هەزار ساڵ بژیایە ) ئەمە ئاواتی موشریکانە,کاتی خۆی بەکاریان هێناوە,لە کاتی پیرۆزبایی کردنی جەژنی نەورۆز,ئێمەش ئەوڕۆکە بەداخەوە بەهەمان وشە زۆرجار پیرۆزبایی لەیەکتر دەکەین .

بۆ نمونە :

یەکێك کە پێمان دەڵێت : جەژنت پیرۆز بێت .

لە وەڵامدا دەڵێین : بە هەزاری جەژنان بێت

واتە : ئاوەتە خوازم تۆ هەزار ساڵ تەمەنت درێژ بێت,هەموو ساڵێکیشت وەك ئەمڕۆ لە ناو خۆشی و شادی و جەژندا بیت .

بێگومان ئەم داب و نەریتەش ڕیشەکەی زۆر کۆنە,ئێمەی کوردیش لە باوك و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە,وە بەهۆی نزیکیمان لە فارسەکان,دەبیستین,خۆمان هەمان ئەم قسەیە دەکەین کە فارسەکان کردوویانە .

کەوابوو : زانیمان لەم ئایەتەدا ئاماژەی بە یەکێك لە داب و نەریتی جەژنی ئاگر پەرستەکانی کردووە,

دووهەم : مەجوسیەکان موشریك بوونە,چونکە ئەوانیش دوو خوایان پەرستووە,بریتی بووە لە خوای خێر و شەڕ .

سێهەم : مەجوسیەکان زۆر حەزیان لێبووە تەمەنیان لە دونیا درێژ بێت,ئەمەش واتای ئەوەیە ئەوان دونیا ویست بوونە .

چوارەم : زیرەکی و زانایی سەرەتا ( ئیبن عباس ) ڕەزای خوای لەسەربێت, بۆمان بەدیار دەکەوێ,کە بەڕاستی شارەزابووە لە ڕاڤەی قورئاندا,بە تایبەتی لێرە بەدیار دەکەوێت : کە مەبەستی موشریکانی غەیرە عەرەبی بووە,نەوەك عەرەب,هەروەها شارازایی زانایان و موفەسیرانی  قورئان,لە تێگەیشتنیان لە دەستەواژە قورئانیەکان .

جا لێرە بۆمان  بەدیار کەوت بە پێی : ڕاڤەی ئیبن عباس و موفەسیران,مەبەست لەم ئایەتە ( جەژنی نەورۆزە )

**بەڵگەی دووهەم :**

**خوای گەورە لە سورەتی ( الفرقان ) هەندێك مدحی بەندەکانی دەکات که یەکێك لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە ئامادەی جەژنی موشریکان نابن وەك دەفەرموویێت :**

( وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ) الفرقان _72

**واتە : یەکێك لە سیفەتەکانی ئیماندارن ئەوەیە کە ئامادەی شاهیدی درۆ نابێت,وە ئەگەر بەلاشیا تێپەڕێت,بە سلامەتی بیر و باوڕی تێدەپەڕێت .**

**بێگومان چەندین زانا لە سەلەفی ساڵح ڕاڤەی ئەم ئایەتەیان بەم شێوە کردووە :**

**ڕاو بۆچوونی ڕاڤەکارانی قورئان لەسەر ئەم ئایەتە :**

**یەکەم : پێشەوا سەمەرقەندی دەفەرموویێت :** قوله ( وَالَّذِينَ لاَ يَشْهَدُونَ الزُّورَ ) يعني: لا يحضرون مجالس الكذب والفحش والكفر وَإِذا مَرُّوا بِاللَّغْوِ يعني: مجالس اللهو والباطل مَرُّوا كِراماً يعني: حلماء معرضين عنها.وقال القتبي: مَرُّوا كِراماً لم يخوضوا فيه، وأكرموا أنفسهم (38)

**واتە : ئامادەی کۆڕ و درۆ " هاوبەش دانان گەورەترین درۆیە" و خراپەکاری و کوفر نابن,وە ئەگەر هات و گەیشتن بەو کوڕ و مەجلیسە شیرك و کوفریانەدا پشتیان تێدەکەن و تەبەڕا دەکەن لە کوفر و ئەهلی کوفر,وە ڕێز لە عقیدە و مەنهەجی خۆی دەگرێ " کە ئیسلام و تەوحیدە"**

**دووهەم : پێشەوا باوکی محمدی ئەندەلوسی,مالکی,437هـ,دەفەرموویێت :** قال : ابن عباس: أن الزور هنا أعياد المشركين وكنائسهم. والزور الباطل (39)

**واتە : ئیبن عباس فەرموویەتی لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا : ئەم (الزور)ە,موبەست پێی : جەژنی موشریك و خاوەنی کەنیسەکانە,کە درۆیەکی پوژ و باتلە .**

**تێبینی : ئێمە لەسەرەوە بە بەڵگە سەلماندمان کە مەجوسەکان موشریکن,**

---

(38) بحر العلوم,ج2 ص547

(39) الهداية الي بلوغ النهاية,ج8 ص5264

سێهەم : پێشەوا ( ثعلبي ) دەفەرموێت : لايشْهدُونَ الزُّور أَي: أعياد الْكفَّار (40)

واتە : مەبەست پێی : جەژنی بێ باوەڕەکانە "لە : جولەکە و گاور و موجوسیەکان"

چوارەم : پێشەوا بەغەوی دەفەرموێت : قَالَ مُجَاهِدٌ: يَعْنِي أَعْيَادَ الْمُشْرِكِينَ (41)

واتە : پێشەوا مجاهید دەفەرموێت : مەبەست پێی : جەژنی موشریکەکانە .

تێبینی : خەتیبی بەغدادی دەفەرموێت : ئیبن عباسیش کە مامۆستای مجاهیدە هەموان بۆچوونی هەیە (42)

پێنجەم : پێشەوا ئیبن جەوزی دەفەرموێت :قال الربيع بن أنس يعني : اعياد المشركين (43)

واتە : ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەفەرموێت : مەبەست پێی : جەژنی موشریکەکانە .

شەشەم : پێشەوا فخرالدين الرازی,606هـ,دەفەرموێت : مَنْ خَالَطَ أَهْلَ الشِّرْك وَنَظَرَ إِلَى أَفْعَالِهِمْ وَحَضَرَ مَجَامِعَهُمْ فَقَدْ شَارَكَهُمْ فِي تِلْكَ الْمَعْصِيَةِ، لِأَنَّ الْحُضُورَ وَالنَّظَرَ دَلِيلُ الرِّضَا بِهِ، بَلْ هُوَ سَبَبٌ لِوُجُودِهِ وَالزِّيَادَةِ فِيهِ، ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا الْمُرَادُ مَجَالِسُ الزُّورِ الَّتِي يَقُولُونَ فِيهَا الزُّورَ عَلَى اللَّه تَعَالَى وَعَلَى رسوله (44)

واتە : هەرکەسێ تێکەڵی ئەهلی شیرك بێت و وە سەیری کارە شیرکەکانیان بکات و وە ئامادەی کوڕەکانیان ببێت,ئەوە بەڕاستی بەژداری کردووە لەسەرجەم کۆڕە شیرکەکان,لەبەر ئەوەی ئامادە بوون و سەیرکردن,بەڵگەیە کە تۆ ڕازیت بەو کوفر و شیرکەوە,بەڵکو بگرە هۆکارێکە بۆ زیادکردنی سێبەری کوفر و شیرك و ئەهلەکانیان,وە ﴿ ئیبن عباس﴾یش دەفەرموێت : مەبەست لە مەجلیس و کۆڕی درۆ,ئەوو درۆیە کە بەخوا و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم دەکەن .

---

(40) الكشف والبيان عن تفسير القرأن,ج4 ص35
(41) معالم التنزيل في تفسير القرأن الكريم,ج3 ص123
(42) الدرالمنثور,للسيوطي,911هجري, ج6 ص283
(43) زاد المسير في علم التفسير,ج3 ص 331
(44) مفاتيح الغيب,ج24 ص485

**حەوتەم : پێشەوا عزی کوڕی عبدالسلام,660ھ,سوڵتانی زانایان دەفەرموویێت : مەبەست پێی : مەجلیسی کوفر و شیرك و گۆرانییە** [45]

**هەشتەم : پێشەوا ( قرطبي ) دەفەرموویێت :** فَسَّرَ الضَّحَّاكُ وَابْنُ زَيْدٍ وَابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّهُ :أَعْيَادُ الْمُشْرِكِينَ[46]

**واتە : ئیمامی زەحاك و کوڕی زەید و ئیبن عباس ڕاڤەیان کردووە بەوەی کە : مەبەست پێی : جەژنی موشریکەکانە**

**نۆیەم : پێشەوا ( ابن کپیر ) دەفەرموویێت :** وَقَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ، وَطَاوُسٌ، وَمُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، وَالضَّحَّاكُ، وَالرَّبِيعُ بْنُ أَنَسٍ، وَغَيْرُهُمْ: هِيَ أَعْيَادُ الْمشْرِكِينَ[47]

**واتە : باوکی عالیە و پێشەوا تاوس و محمدی کوڕی سیرین و ئیمام زەحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و جگە لەوانیش دەفەرموون : مەبەست پێی : جەژنی موشریکەکانە .**

**دەگێڕنەوە لە سەرخەری سونەت,پێشەوا ئەحمەد,241ھ,کە فەرموویەتی : درووست نییە ئامادە بوون لە جەژنی گاور و جولەکە و موشریکەکانی تر**[48]

(45) تفسيرالقرأن"اختصار لتفسير الماوردي"لعبدالعزيز بن عبدالسلام, ج2 ص434
(46) الجامع الأحكام القرأن,ج13 ص80
(47) تفسير ابن كثير,ج6 ص130

(48) أحكام أهل الملل من الجامع المسائل ابن حنبل,لأبي بكر الخلال,باب:كراهية خروج المسلمين في اعياد المشركين,ص51

## پوختەی قسە :

**خوشك و برایانی یەك خوا پەرستم,ڕووی بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە : ئەو كەسەی ئامادەی جەژنی موشریكان نەبێت,ئەوە بە بەندەی ناسراوی خوای گەورە هەژمار دەكرێت,هەروەها ستایش وە مەدحیش دەكرێت,لە لایەن پەروەردگارەوە,بەڵام ئەگەر ئامادەی جەژنی موشریكان ببێت,ئەوە بەبەندەی ناسراوی خوا هەژمار ناكرێت,وە هەروەها ستایش و مەدحیش ناكرێت,جا ئەگەر ئەمە حاڵی ئەو كەسە بێت,كە تەنها ئامادە دەبێت,ئەی باشە دەبێت,حاڵی ئەوە چۆن بێت كە موافقەی دەكات,وە بەڕاستی دەزانێت.** [49]

**كەوابوو : لێرە بۆمان دەردەكەوێت,ئامادەبوونی كارێكی نادرووستە,ئەگەرچی ئامادە بوونەكەش تەنها بینین و بیستنە .**

---

(49) تێبینی : بۆ زیاتر شارەزابوون سەیری پەرتووكی : شیخ الاسلام ابن تیمیە,اقتچاو الصراگ المستقیم لابن تیمیە,ص156_159_160 بكە

**تێبینی :**

**پێش ئەوەی بێم بەڵگە لە فەرموودە بهێنمەوە  بێم خۆشە چەند شتێك ڕوون بكەمەوە,هەر چەندە لە سەرەتاش باسمان كرد بەڵام لێرە پێویست ڕوونـتری بكەمەوە بۆ ئەوەی فەرموودەكان  بە جوانی تێبگەن ئەوانیش :**

★_**عيد النيروز** " **جەژنی نەورۆز**"

وهو أعظم أعيادهم وعيدهم الأكبر، ويقع في أول يوم من سنتهم

ويقال : نوروز أي اليوم الجديد.(50)

**واتە : گەورەترین جەژنیانە و وە بەگەورەترین جەژنە لایان,وە لەیەكەم ڕۆژی سەری ساڵە.وە دەڵێن : نەورۆز واتە : ڕۆژی نویٚ**

★_ **مهرجان**

وهو في اليوم السادس عشر من مهرماه من شهور الفرس وبينه وبين النيروز مائة وسبعة وستون يوماً، ويكون في وسط الخريف ومدته ستة أيام، ويسمى السادس منه المهرجان الأكبر(51)

**واتە : میهرەجان واتە : لە ڕۆژی 16 لە مانگی "مهرماه" لە مانگی فارسی, نێوانی ئەو و جەژنی نەورۆز 176 ڕۆژە,كە دەكەوێتە ناوەندی وەرزی هاوین,وە ماوەی جەژنی میهرەجانەكە 6 ڕۆژە,وە كۆتا ڕۆژی میهرەجانەكە كە كۆتا ڕۆژیەتی پێی دەڵێن : میهرەجانی گەورە.**

---

(50) تاريخ اليعقوبي (174/1) ، وانظر: بلوغ الارب للألوسي (348/1) الأعياد وأثرها على المسلمين ص67

(51) تاريخ اليعقوبي (175/1) ، ونخبة الدهر لأنصاري (379) ، وصبح الأعشى للقلقشندي (421-420/2)

**بەڵگەی یەکەم :**

**تاکە پێشەوام پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت**

﴿ خَالِفوا المشرِكين ﴾[52]

**لە ڕوایەتی تر هاتووە** ﴿خالِفوا المَجوس ﴾ [53]

**واتە : پێچەوانەی موشریکان بکەنەوە.....یان پێچەوانەی ئاگر پەرستەکان**

**هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموویێت** ﴿ من تشبه بقوم فهو منهم ﴾[54]

**واتە : هەر کەسێ خۆی بچوێنی بە قەوم و گەلێك ئەوە لەوانە**

**ئازیزانم پێش ئەوەی شیکردنەوەی ئەم فەرموودەت بۆ بکەم ڕوون کرنەوەیەکی کورت لەسەر " تشبە " و حوکمی خۆ چواندن بەوان و واجبێتی موخالفەی ئەوان چیە ؟ وە چۆنە ؟ بۆتان ڕوون بکەمەوە :**

---

(52_53) وأخرجه البخاري (5892) ، ومسلم (259) (54) ، وأبو عوانة 189/1، والبيهقي في "السنن" 150/1، وفي "الشعب" (6433) ، والبغوي (3194) من طريق عمر بن محمد بن زيد بن عبد الله بن عمر، عن نافع، به.
وفي أوله زيادة: خالفوا المشركين، ولفظها عند أبي عوانة: خالفوا المجوس,قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح.
(54) رواه أبو داود برقم : 4031,وغيره,وصححه الامام الالباني في صحيح الجامع برقم : 6149

## پێناسەی " التشبه " لە زمانەوانی عەرەب و لە زاراوەی زانایانی عەقیدە :

**لە زوبانی عەرەبی : من شبه** "الشين والباء والهاء" أصل واحد يدل على تشابه الشيء وتشاكله لوناً ووصفاً[55]

**واتە : شین و با و ها,یەك بنچینەن دەلالەت لەسەر خۆ لەیەكچواندنی شتێك بكات,لە شێوە و ڕەنگ و سیفەت**

**لە زاراوەی زانایان :** فهو: عبارة عن محاولة الإنسان أن يكون شبه المتشبه به أو على هيئته وحليته ونعته وصفته، أو هو: عبارة عن تكلف ذلك وتقصده وتعلمه. وقد يعبر عن التشبه بالتشكل والتمثل والتزيي والتحلي والتخلق، أو يختص هذا الأخير بتكلف الأخلاق والطبائع والصفات اللازمة[56]

**واتە :بریتیە لە هەوڵدانی كەسێك لە خۆ چواندن بە كەسێك جا لە شێوە و ڕووخسار "واتە: تجمیل كردن و گۆڕینی شێوەت بۆ ئەوەی بە كەسێك بچیت"یا پێوەهەڵواس كردنی شتی جوان بۆ ئەوەی لە كەسێك بچیت,لە تەبیعەت و سیفەت,یان بریتیە لە : زۆر لە خۆكردن بە مەبەستی خۆ چواندن و فێربوونی,كە بریتیە لە : خۆ چواندن لە شێوە و نواندن و ڕازاندنەوە و شتی جوان و یان ڕوەشت,بەتایبەت لەم دوایەدا بە زۆری كردن لە چواندندا لە ڕەوشت و تەبیعەت و سیفەتە چەسپاوەكان"تجمیل"**

(55) معجم مقاييس اللغة لابن فارس (243/3)

(56) القاموس المحيط (1610) ، ولسان العرب (503/12) ، مادة "شبه" والمصباح المنير (303)

**ئازیزانم ئێمە ئیجماعی زانایانمان هەیە لەسەر مخالفەکردنی شیرك و ئەهلی شیرك کە لێرە نەقلی چەند وتەیەك دەکەین :**

**یەکەم** : فلقد جاء في شروط عمر رضي الله عنه، التي اتفق عليها الصحابة وسائر الفقهاء بعدهم " أن أهل الذمة لا يخرجون صليباً ولا كتاباً في أسواق المسلمين ولا يظهرون أعيادهم[57]

**واتە : هاتووە لە مەرجی سەردەمی خیلافەتی پێشەوا عمر,کە کۆك بوونی هەموو هاوەڵان و شەرع زانەکانی پاش ئەوان لەسەر ئەوە بووە کە : "أهل الذمة"[58] ,نابێت دەربچن بە خاچ و پەرتووکەکانیان لەناو بازاڕی موسڵمانان و وە نابێت بە ئاشکرا جەژنە شیرکەکانیان بکەن .**

**دووهەم** : ولقد نقل الاتفاق شيخ الإسلام ابن تيمية حيث قال: "فإذا كان المسلمون قد اتفقوا على منعهم من إظهارها، فكيف يسوغ للمسلمين فعلها؟ أو ليس فعل المسلم لها أشد من فعل الكافر لها، مظهراً لها [59]

**واتە : شێخی ئیسلام ابن تیمیە پاش ئەوەی نەقلی ئیجماع دەکات لەسەر مخالفەکردنی ئەهلی شیرك,دەفەرمووێت : موسڵمانان کۆکن لەسەر ڕێگری کردن لە گێڕانی جەژنی موشریکان بە ئاشکرا,چ جای ئەوەی موسڵمان جەژنەکە بکەن ؟ باشە کاری موسڵمانەکان خراپتر گەورەتر نیە لە ئەوەی کافرەکان دەیکەن ؟ وە ببنە ئاشکرا کەر بۆیان ؟**

.

(57) 1 السنن الكبرى للبيهقي، كتاب الجزية، باب الإمام يكتب كتاب الصلح على الجزية (202/9) ، وانظر: أحكام أهل الذمة (725-724/2) .

(٥٨) اهل الذمة : **ئەو کەسە یهودیانەن کە جزیەیان دەدا بە دەولەتی ئیسلامی.لە بەرامبەر پاراستنیان لە شەڕی دوژمنانیان و بەسڵامەتی لەژێر سێبەری خیلافەت دەژیان**

(٥٩) اقتضاء الصراط المستقيم (454/1)

**چەند وتەیەك لە نا درووستی خۆ چواندن بە كافران و بەژداری جەژنەكانیان ئەوانیش :**

**یەكەم :** قال شيخ الإسلام ابن تيمية: "ولا نتشبه بهم في الأعياد فلا يعان المسلم المتشبه بهم في ذلك، بل ينهي عن ذلك، فمن صنع دعوة مخالفة للعادة في أعيادهم لم تجب دعوته، ومن أهدى من المسلمين هدية في هذه الأعياد، مخالفة للعادة في سائر الأوقات، غير هذا العيد، لم تقبل هديته، خصوصاً إن كانت الهدية مما يستعان بها على التشبه بهم[٦٠]

**واتە : شێخی ئیسلام ابن تیمیە دەفەرموویێت : خۆچواندن و هاوشێوەی جەژنەكانی ئەوان مەكەن,نابێت موسڵمان یارمەتیان بدات لەسەر ئاشكراكردنی جەژنەكەیان,ئەگەر هات و موشریكان بەپێچەوانەی ڕۆژانی ئاسایی دەعوەتیان كردن بۆ جەژنەكانیان,جەوابی دەعوەتەكە مەدەنەوە,ئەگەر هات و موسڵمان دیاری بەخشی لەم ڕۆژەدا جگە لە ڕوژانی ئاسایی,بەڵام جگە لەكاتی تر و غەیری ڕۆژی جەژنەكەیان,ئەوە دیاریەكان وەرمەگرن,بەتایبەت ئەگەر هات و ئەم دیاری بەخشینە لێكچون بێت بە دیاری بەخشینی موشریكان.**

**دووهەم : ابن الحاج دەفەرموویێت :** أنه لا يحل للمسلمين أن يبيعوا للنصارى شيئاً من مصلحة عيدهم ... ولا يعانون على شيء من دينهم، وينبغي للسلاطين أن ينهوا المسلمين عن ذلك، وهو قول مالك وغيره[61]

**واتە : درووست نییە بۆ موسڵمانان شتێك بفرۆشێت بە گاورەكان بۆ بەرژەوەندی جەژنەكەیان "واتە : ئەگەر زۆریش قازانجت كردیش,بۆت درووست نییە" وە یارمەتیان مەدەن لەسەر هیچ شتێكی دینەكەیان,وە پێویستە لەسەر دەسەڵاتدارانی موسڵمان كە ڕێگری بكەن لەم شتە,ئەوەش وتەی ئیمام مالیك و غەیری ئەوە**

---

(60) مجموع الفتاوى (319/25)

(61) المدخل لابن الحاج (2/47-48) ، وانظر: أحكام أهل الذمة لابن القيم (725/2)

ئازیزانم پاش ئەوەی زانیمان خۆچواندن و موافق بوون لەگەڵ جەژنە شیرکیەکانیان نادرووست و حەڕامە وە زانیمان کە پێچەوانەکردنیان واجبە

لە فەرموودەی ﴿ خالفوا المشركين ﴾ یان ﴿ خالفوا المجوس ﴾ ئەم فەرمانە هاتووە لەم دوو فەرموودەیە کە بەدارِشتنی داخوازی بۆ وا جببێتیە،هەروەك باسکراوە لەلای زانایانی ئصوڵی،واتە : لەسەرتان بەواجب دانراوە موخالەفەی ئەوان بکەن .

ئێمە بۆمان ڕوون بۆیەوە خاوەنی جەژنی نەورۆز ئاگر پەرست و موشریکەکانن بە پێی ئەم ئاماژەیەی کە کراوە لە سوڕتی بەقەڕە،دەی ئێمە ئەگەر پێچەوانەی ئەوان ڕەفتار نەکەین،بریتیە لەسەرپێچی کردنی فەرمانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم،چونکە ئەو بە شێوازی داخوازی فەرمانی کردووە بە ئێمە،کە پێچەوانەی موشریك و ئاگر پەرستان بکەین.

هەروەها لەبارەی فەرموودەی ﴿ من تشبه بقوم فهو منهم ﴾ ئەوە دەچێتە بابی " المولاه و المعاداه" واتە : دۆستایەتی و دوژمنایەتی یان خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە

بێگومان بابەتی ﴿ دۆستایەتی و دوژمنایەتی﴾ یان ﴿ خۆشەویستی و ڕق لێبونەوە ﴾ یەکێکە لە لە بابەتە هەرە گرنگەکانی بیرو باوڕی ئایینی پیرۆزی ئیسلام .

ڕووی بەڵگە بوونی ئەم فەرموودەیەش ئەوەیە : ئەو کەسە خۆی دەچوێنی بە موشریك و ئاگر پەرستەکان،وە کارەکانیان بە گەورە و پیرۆز بزانێت،دیارە ئەوانی خۆش دەوێت و ڕقی لێیان نابێتەوە،بیێگومان ئەو کەسە لەوانە،واتە : لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێت .

**خاوەنی پەرتووکی ( الجامع الاصغر ) زانایەکە لە حەنەفیەکان لە شەرحی ئەم فەرموودیە دەفەرموویت :**

"اذا أهدى يوم النيروز الى مسلم أخر ولم يرد به تعظيم اليوم ولكن علي ما اعتاد بعض الناس لايكفر,ولكن ينبغي له أن لايفعل ذالك في ذالك اليوم خاصة ويفعله قبله أو بعده لكي لايكون تشبيها بأولئك القوم.وقد قال صلى الله عليه وسلم ( من تشبه بقوم فهو منهم )[62]

**واتە : ئەگەر موسڵمانێك دیاری پێشکەش کرد بە موسڵمانێکی تر لە ڕۆژی نەورۆزدا مەبەستی پێ گەورە دانانی ئەم ڕۆژە نەبێت,بەڵکو لەسەر ئەم ڕاهاتنە بووە کە هەندێ خەڵکی دەیکەن,ئەوە کافر نابێت,بەڵام پێویستە ئەو کارە لەو ڕۆژە بە تایبەتی نەیکات,بەڵکو لە پێشی یان لە پاشی بیکات,بۆ ئەوەی نەبێت بە خۆ چواندن بەو قەومەچونکە بەڕاستی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : هەرکەسێك خۆی بچوێنێت بە قەومێك ئەوە لەوانە .**

---

(62) البحر الرائق شرح كنز الدقائق للعلامة ابن نجيم ج8 ص55

**هەروەها پێشەوا ئیبن کەسیر لە شەرحی ئەم فەرموودیە دەفەرموویت :**

" من تشبه بقوم فهو منهم" فليس للمسلم أن يتشبه بهم لا في أعيادهم ولا مواسمهم ولا في عباداتهم؛ لأن الله تعالى شرف هذه الأمة بخاتم الأنبياء الذي شرح له الدين العظيم القويم الشامل الكامل، الذي لو كان موسى بن عمران الذي أنزلت عليه التوراة وعيسى بن مريم الذي أنزل عليه الإنجيل حيين لم يكن لهما شرع متبع، بل لو كانا موجود ين، فإذا كان الله تعالى قد منّ علينا بأن جعلنا من أتباع محمد صلى الله عليه وسلم، فكيف يليق بنا أن نتشبه بقوم قد ضلوا من قبل وأضلوا كثيراً وضلوا عن سواء السبيل، فقد بدلوا دينهم وحرفوه وأولوه حتى صار كأنه غير ما شرح لهم أولاً,هو بعد ذلك كله منسوخ والتمسك بالمنسوخ حرام لا يقبل الله منه قليلاً ولا كثيراً ولا فرق بينه وبين الذي لم يشرع بالكلية والله يهدي من يشاء إلى الصراط المستقيم"[63]

**واتە : "هەرکەسێك خۆی بچوێنێت بە قەومێك ئەوە لەوانە" بۆ موسڵمان نییە کە خۆی بچوێنێ بەوان نە لە جەژنەکانیان وەنە لە مەڕاسیمەکانیان,وە نە لە پەرستنەکانیان,لەبەر ئەوەی کردگار ڕێزی بەخشی بەم ئومەتە بە کوتا پێغەمبەران "کە پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم,کە ئەم دینە گەورەیە و بەهێزە و تەواوەی بۆ ڕوون کردینەوە,کاتی موسای کوڕی عمران تەوڕاتی بەسەردا هاتە خوارەوە و عیسای کوڕی مریەم ئینجیلی بۆ هاتە خوارەوە.زیندوو بوون بەڵام دینەکەیان دینێکی کامل نەبوو بە بەدوا کەوتنی,تەنها بۆ ناساندنی تەوحید بوو,وەك ئیسلام کامڵ و شامڵ نەبوون,کەچی هەردووکیان مابوون,ئەوەبوو خوای کردگار منەتی بەسەرکردین بەوەی بووین بە یەکێك لە شوێن کەوتووانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,چۆن دەگونجێ بۆ ئێمە خۆمان بچوێنین بە قەومانێك کە پێش ئێمە گومڕابوون و زۆریشیان گومڕا کرد,وە گومڕابوون لەسەر ڕلستە شەقامی تەوحید,بەڕاستی دینەکەیان گۆڕی و هەڵیان گێڕا لەسەر حەقیقەتی خۆی,تاوەکو گەیشتنە ئەوەی لەسەر ئەوە نەمان کە خوا بۆی داڕشتبوون.....**

(63) البداية والنهاية لابن كثير (134/2)

له پاش ئەوە دینەکانی تر گشتن هەڵوەشانەوە بە پەیامی ئیسلام,دەست گرتن بە حوکمی هەڵگیراو حەرامە, خوای پەروەردگاریش قەبوڵی ناکات چ بەکەم یان بە زۆر,هیچ فەرق نیە لە نێوانیان ,بەڵکو گشتی ڕەت دەکرێتەوە,وە خوای گەورە خۆی ویستی لەکێ بێت ڕێنمویی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست

بەڵام زۆر بەداخەوە ئێمەی موسڵمان ئەمڕۆ شوێنکەوتەی بۆنە و جەژنی مەجوسیەکانین,ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی,هەروەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,دەفەرموویت " لاتقوم الساعة حتي تأخذ أمتي ما أخذ الأمم القرون قبلها شبرا بشبر و ذراعا بذراع قالوا : يارسول الله كما فعلت فارس والروم ؟ قال : وهل الناس الا أولئك "[64]

واتە : ڕۆژی دوایی هەڵناستێت تاوەکو ئوممەتی من ڕێبازی ئوممەتەکان و چەرخەکانی پێش خۆیان وەردەگرن لەوەی کردوویانە,بست بە بست,باڵ بە باڵ,وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت ئەوەیە هەروەك فارس و ڕۆمەکان کردوویانە؟ فەرمووی : ئایا مەبەست لە خەڵك کێیە جگە لەوان.

(64) البخاري في صحيحه برقم : 7319,وأحمد في مسنده برقم :8291_8792

**بەڵگەی دووهەم :**

**تاکە پێشەوام پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم دەفەرموویت**

**ئەنەس دەگێڕێتەوە** " قدم رسول الله صلى الله عليه وسلم,المدينة ولهم يومان يلعبون فيهما فقال:ماهذان اليومان؟ قالوا: كنا نلعب فيهما في الجاهلية,فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم,ان الله قد أبدلكم بهما خيرا منهما : يوم الأضحي,ويوم الفطر" (65)

**واتە : پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵکی مەدینەش دوو ڕۆژیان هەبوو کە یاری خۆشیان تێدا دەگێڕا,ئەویش فەرمووی : ئەم دوو ڕۆژە چییە؟ فەرموویان : ئەم دوو ڕۆژەیە کە لەسەردەمی نەفامیدا ئێمە تێدا خۆشی و یاریمان دەکرد,ئەویش فەرمووی :بەڕاستی خوای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕین بە چاکتر لەم دووانە : کە ئەوانیش ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزانە.**

(65) رواه أبو داود برقم : 1134,والنسائي برقم:1556,وصححه الالباني فيي السلسلة الصحيحة برقم : 2021

**ڕاڤەی فەرمووودەناسان :**

**پێشەوا ملا على قارئ,1014ھ,لەسەر شەرحی ئەم فەرموودەیە دەفەرموویت : (**يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا**) :** وَهُمَا: يَوْمُ النَّيْرُوزِ، وَيَوْمُ الْمِهْرَجَانِ[66]

**واتە : ئەم دوو ڕۆژە جەژنی نەورۆز و ڕۆژی میهرەجان بوو**

**هەروەها پێشەوا باوکی تەیب ئابادی لە شەرحی دەفەرموویت : (**يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا**) :** وَهُمَا: يَوْمُ النَّيْرُوزِ، وَيَوْمُ الْمِهْرَجَانِ كَذَا قَالَهُ الشُّرَّاحُ [67]

**واتە : ئەم دوو ڕۆژە جەژنی نەورۆز و ڕۆژی میهرەجان بوو,هەروەك ڕاڤەكاران وایان فەرمووە**

**هەروەها پێشەوا مەناوی,1031ھ,لەشەرحی دەفەرموویت :** وَلأَهل الْمَدِينَة يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فيهمَا فِي الْجَاهِلِيَّة) يَوْم النوروز وَيَوْم المهرجان[68]

**واتە : خەڵكی مەدینە سەردەمی نەفامی دوو ڕشژیان هەبوو ئەویش : نەورۆز و میهرەجان بوو**

---

(66) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح,ج2 ص1069 وفي مكان أخر ج5 ص44
(67) عون للعبود شرح سنن أبي داود ج4 ص19,التنوير شرح الجامع الصغير للصنعاني ج8 ص59
(67) التيسير بشرح الجامع الصغير ج2 ص 194_فيض القدير شرح الجامع الصغير ج4 ص511_668

**هەروەها پێشەوا ملا على قارئ لە شوێنێکی تر دەفەرمووێت** : وقد شرع الله لنا هذين العيدين ليكونا بديلين عن عيد النيروز والمهرجان، وهما عيدان فارسيان كانا يقامان لإحياء الشعائر المجوسية، فأبدلهما الله بالفطر والأضحى لإحياء الشعائر الحنيفية. وسن لنا فيهما الخروج إلى المصلى لإظهار شوكة الإسلام وقوته، وجلاله وأبهته في هذا المشهد العظيم، وإنما سمي العيد عيداً لأنه يعود على الناس بالفرحة والسرور، ويعود الله فيه على عباده، فيتجلى عليهم بالرحمة والغفران[68]

**واتە : پەروەردگار بۆی چەسپاندین بە دوو جەژن "قوربان و ڕەمەزان" لە بەدیلی جلەژنی نەورۆز و میهرەجان,کە دوو جەژنی فارسین,کە ببوە هۆی بەرز ڕاگرتنی شیعاری ئاگرپەرستەکان,خوای گورە بۆی گوڕین بە جەژنی قوربان و ڕەمەزان,بۆ زیندووکرنەوەی شیعاری تەوحید و یەك خوا پەرستی,وەدەردەچین بۆ مزگەوت بۆ نیشاندانی گورەیی ئیسلام و هێزەکەی,وە هەیبەت و سامەکی لەم ڕۆژە گەورەدا,لەبەر ئەوەی ناوی لێنراوە "عید" لەبەر ئەوەی دووبارە خۆشی دەگەڕێتەوە بۆ سەر موسڵمانان,وە خوای پەروەردگار بە لێخوشبون و بەڕەحمی دەگەڕیت بە بەندەکانی.**

**پێشەوا مظهر دەفەرمووێت** : فِيهِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ تَعْظِيمَ النَّيْرُوزِ وَالْمِهْرَجَانِ وَغَيْرِهِمَا أَيْ: مِنْ أَعْيَادِ الْكُفَّارِ مَنْهِيٌّ عَنْهُ[69]

**واتە : ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر بە گەورەدانانی نەورۆز و میهرەجان,وە غەیری ئەویش واتە : لە جەژنی موشریکەکان نەهیان لێکراوە.**

---

(68) شرح مختصر صحيح البخاري,ج2 ص267
(69) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح,ج2 ص106

**کەواتە ئەمە وتەی ئەو زانایانەیە کە فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,ڕاڤە دەکەن و ڕوونی دەکەنەوە,بێگومان ئێمە ئەگەر عەرەبیەکی باشیش بزانین ناتوانین وا بە ئاسانی لە زۆربەی فەرموودەکان بگەین مەگەر بە یارمەتی زانایانی ڕاڤەکار بێت.**

**دیارە ڕاڤەکاران فەرموویانە ئەم دوو ڕۆژە بریتیە لە : نەورۆز و میهرەجان,لێرە چەند شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە :**

**یەکەم : عەرەبەکانیش لە سەردەمی جاهیلیدا جەژنی نەورۆزیان گێڕاوە.**

**دووهەم : ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی داوە بە جەژن.**

**سێهەم : ئەگەر جەژنی نەورۆز کارێکی چاك بوایە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,بە خەڵکی مەدینەی ڕانەدەگەیاند " بەڕاستی خوای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕین بە چاکتر لەم دووانە" کە یەکێکیان "نەورۆز"بوو.ئەمەش واتای ئەوەیە : دەست هەڵگرن لە گێڕانی,ئەگەر ئاسایی بوایە,دەیفەرموو: بەردەوام بن.**

**چوارەم : لە دوای ئەم فەرموودەیە تا ئێستاش لەگەڵدا بێت خەڵکی مەدینە نەورۆز و میهرەجانیان نەگێڕا**

**پێنجەم : ئەم فەرموودەیە بەرپەرچە بۆ ئەوانەی کە بەهەڵە حاڵی بوونە بۆ ئەم فەرموودەیە پێغەمبەر گیان فەرموویەتی :** «يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا»(70)

**واتە : بەڕاستی هەموو نەتەوەیەك جەژنی خۆی هەیە,ئەمەش جەژنی ئێمەیە**

---

(70) صحيح البخاري.برقم : 909,مسلم برقم : 892

**بەڵگەی سێهەم :**

**تاکە پێشەوام پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت**

" نذر رجل علي عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم,أن ينحر ابلا ببوانة فأتي النبي صلى الله عليه وسلم,فقال : اني نذرت أن أنحر ابلا ببوانة,فقال النبي صلى الله عليه وسلم,هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يعبد قالوا لا قال هل كان فيها عيد من أعيادهم قالوا لا قال رسول الله صلي الله عليه وسلم,أوف بنذرك فانه لالا وفاء لنذر في معصية الله ولا فيما لايملك ابن ادم"(71)

**واتە : پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,نەزری کرد کە وشترێك لە (بوانە )جا هاتە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,فەرمووی : ئایا لەو شوێنەدا هیچ بتێك لە بتەکانی سەردەمی نەفامی تیایدا پەرستراوە؟فەرموویان : نەخێر,ئەویش فەرمووی : ئایا لەو شوێنەدا هیچ جەژنێك لە جەژنەکانیان تیایدا کراوە؟ فەرموویان : نەخێر, پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : دەی وەفا بنوێنە بەرامبەر نەزرەکەت,وە بەجێی بهێنە,چونکە بەرشاستی وەفا نواندن نییە بۆ نەزرێك کە سەرپێچی خوای تێدا بێت,یاخود لە شتێك کە بەنی ئادەم نەتوانێت بیکات**

(71) رواه أبو داود برقم : 3313,وغيره,وصححة ابن حجر في التخليص

بەبێ جیاوازی لە نێوان زانایان جێبەجێ کردنی نەزر واجبە,بە مەرجێك خاوەنەکەی توانای هەبێت,لەسەر کردنی,هەروەها سەرپێچی کردنی خوای گەورەی تێدا نەبێت .

لەم فەرمودە پیرۆزە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەگەر چی جێبەجێ کردنی نەزر واجبە بەڵام هەندێك شوێن بۆتە بەربەست لە جێبەجێ کردنی,بۆ نمونە :

ئەم شوێنەی لەم فەرموودەیە باسکراوە, پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم,دوو هۆکاری کردۆتە بەربەست لە جێبەجێ کردنی نەزر :

یەکەم : ئەگەر بت لەم شوێنەدا پەرسترابێت .

دووهەم : ئەگەر جەژن و ئاهەنگی کافر و موشریکەکان تیایدا گێڕدرابێت .

جا ئەم قبوڵ نەکردنە لە بارەی کردنی کارێکی واجبەوە بەم شێوەیە بێت,دەبێ لەبارەی کردنی کارێکی ناشەرعی چۆن بێت؟!!!!.

دیارە جەژنی کافر و موشریکان مایەی گوناه و توڕەیی و ناڕەزایی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم.قبوڵ ناکات ئەم نەزرە لەم شوێنە بکرێت,ئەگەر قبوڵ نەکات بۆ ئەوەی واجبێك لەم شوێنە ئەنجام بدرێت,چۆن قبوڵ دەکات جەژنەکانیان بەشەرعی لەقەڵەم بدرێت؟,کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر ناشەرعیەتی جەژنی کافران و موشریکان .

**بەڵگەی چوارەم :**

**تاكە پێشەوام پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت**

**دایە گیانم دایە عائیشە دەگێڕتەوە "** دخل أبوبكر وعندي جاريتان من جواري الأنصار تغنيان بما تقاولت الأنصار يوم بعاث قالت وليستا بمغنيتين فقال أبوبكر أمزامير الشيطان في بيت رسول الله صلى الله عليه وسلم,وذالك في يوم عيد فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم,يا أبابكر ان لكل قوم عيدا وهذا عيدنا(72)

**واتە : ئەبو بكر هاتە ژوورەوە منیش دوو كیژۆڵە لە جاریەكانی ئەنصاریم لەلابوو كە گۆرانیان دەووت لەسەر ڕۆژی " بوعاس" كە دەوتراوە لەلای ئەنصاریەكان,فەرمووی : ئەوانە گۆرانی بێژ نینە,ئەبوبكر فەرمووی : ئایا دەنگ و زوڕنای شەیتان لە ماڵی پێغەمبەری خوا؟ئەمەش لە ڕۆژی جەژن بووە,پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم,فەرمووی : ئەی ئەبو بكر بەڕاستی هەموو نەتەوەیەك جەژنی خۆی هەیە,ئەمەش جەژنی ئێمەیە .**

(72) اخرجه البخاري.برقم : 909,مسلم برقم : 892

ڕۆژی " بوعاس " ڕۆژێکی ناسراو بووە لە ڕۆژە بەناوبانگەکانی عەرەب.کە لەو ڕۆژەدا "ئەوس" زۆری لە "خەزرەجیان"کوشتووە,بۆ ماوەی سەد و بیست ساڵ شەڕ لە نێوانیاندا بەردەوام بووە تاکو ئیسلام هات,جا ئەم دوو کیژۆڵەیە ئەم شەڕەیان بە گۆرانی دەوت .

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەر نەتەوەیەك جەژنی تایبەتی خۆیی هەیە,وەك : خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ لكل جعلنا منكم شرعة و منهاجا ] المائده: 48

واتە : بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێبازێکی ڕوونمان داناوە .

بێگومان شەریعەتی ئێمە جیاوازە لەگەڵ شەریعەتی کافران و موشریك و ئاگر پەرستان,هەروەها عیبادەتمان جیاوازە لەگەڵ عیبادەتی ئەوان,وە قیبلەمان جیاوازە لەگەڵ قیبلەی ئەوان,وە نوێژمان جیاوازە لەگەڵ نوێژی ئەوان,وە ڕۆژیمان جیاوازە لەگەڵ ڕۆژی ئەوان,کەوابوو : جەژنیشمان جیاوازە لەگەڵ جەژنی ئەوان .

ئەوەی لەم فەرموودەیە هاتووە واتای ئەوە ناگەیەنێ کە جەژنی ئەوان ڕاست و درووستە,یان هەروەك هەندێك بەهەڵە لەم فەرموودەیە تێگەشتوون,دەڵێن :

مەبەستی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,شەرعیەتی داوە بە جەژنی هەموو نەتەوەکان,گوایە هەموو نەتەوەیەك جەژنی تایبەتی خۆی هەیە.

لە وەڵامدا دەڵێین : باشە بۆچی لە فەرموودەکەی پێشتر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,داوا لە خەڵکی مەدینە دەکات,کە ئەم دوو جەژنە بگۆڕن,بە جەژنی قوربان و ڕەمەزان,دیارە نابێت و درووست نییە,لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا تۆ جەژنێك بگێڕی غەیری جەژنی ئیسلام بێت,جا جەژنی نەتەوەیی بێت یان ئاینی بێت یان داب و نەریت بێت یان لاساییکردنەوە بێت,یا هەر جەژنێت بێت غەیری جەژنی ئیسلام .

بەڵام ئەوەی لەم فەرموودەیە هاتووە کە دەفەرمووێ : "بەڕاستی هەموو نەتەوەیەك جەژنی هەیە,ئەمەش جەژنی ئێمەیە " مەبەستی بەشەرعی دانانی جەژنی ئەم نەتەوانە نییە,واتە : لە ڕووی دانانی "انشائی"نییە,بەڵکو لە ڕووی زانیاری و هەواڵپێدانە ( تعلیم واخبار ) یانی : هەموو ئاینێك جەژنی خۆیان هەیە,ئێمەش جەژنی ئاینیمان ئەم دوو ڕۆژەیە,هی ئەوان بۆ خۆیان لەگەڵ نادرووستی و نارەوایی جەژنەکەیان,هی ئیمەش بۆ خۆمان لەگەڵ درووستی و ڕەوایی جەژنەکەمان,بەڵێ ئەوەیە مانا ڕاستەقینەکەی .

**کەواتە : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جەژنی هەر قەومێك پەیوەستە بە ئاینەکەیەوە,نەك پەیوەستە بەخودی نەتەوەکەیەوە,چونکە ئیسلام پێکهاتووە لە هەموو قەوم و نەتەوەیەك,ئەگەر وابوایە ئەو کاتە موسڵمانەکان هەریەکیان لە ڕاست قەومی خۆیەوە دەیکردە جەژن و بێ ئەوەی ئاوڕ لە ئاینەکەی بداتەوە,ئەوسا بەسەدان جەژن لەناو موسڵمانان دەگێڕدرا,کە ئەمەش بریتییە لە پەرتەوازەیی و تەفرەقە,پەرتەوازەیی و تەفرەقەش لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەهی لێکراوە .**

**خوشك و برایانی یەك خوا پەرستم,دەتوانین بڵێین : یەكدەنگی صەحابە و تابعی و زاناكان هەیە لەسەر نا درووستێتی بەژداریكردن لە بۆنە و جەژنی كافراندا,بەڵگەش لەسەر ئەمە بریتیە لەو ئیتیفاقەی كە صەحابە و شەرع زاناكان هەیانە,لەسەر ئەو مەرجانەی ئیمامی عومەر,داینـاوە لەسـەر " أهل الژمە " كە ئەوانە خاوەن كتێب و مەجوسیەكان دەگرێتەوە,ئەوانە دانیشتووی ناو خاكی موسڵمانان,جا یەكێك لەو مەرجانەی كە هاتووە ئەوەیە : نابێت ئەهلی زیممە بە ئاشكرا بۆنە و جەژن بگێڕن لەناو خاكی موسڵمانان .**

**لەسەر ئەم مەرجەی ئیمامی عومەر,هیچ صەحابە و تابعی و زانایەكی سەلەف موخالەفەیان نەبووە,بەڵكو هەموویان لەگەڵێدا یەكدەنگ بوونە .**

**كەوابوو : ئەگەر سەلەف یەكدەنگبن لەسەر گێڕانی بۆنە و جەژنی كافران بە شێوەیەكی نهێنی لەناو موسڵمانان,چۆن ڕێگە ئەدەن بە خۆیان فەتوا بدەن خەڵك بەژداری تیایدا بكەن؟!!.**

**یەكەم : ئیمامی عومەری كوڕی خەتاب دەفەرموێت : لاتدخلوا على المشركين في كنائسهم يوم عيدهم فان السخگە تنزل عليهم** (73)

**واتە : مەچنە لای موشریكەكان لە كەنیسەكانیان لە ڕۆژی جەژنیاندا,چونكە لەو ڕۆژەدا توڕەیی خوا دادەبەزێتە سەریان**

---

(73) أخرجه البيهقي بسند صحيح في السنن الكبري برقم : 1864

**ديسانەوە پێشەوا عومەر دەفەرموێت :** اجتنبوا أعداءالله في أعيادهم [74]

**واتە : دووركەونەوە لە دوژمنانی خوا لە ڕۆژی جەژنیاندا**

**دووهەم : عبدالله ی کوڕی عەمر فەرموويەتی :** مَن بَنَي ( أو مر ) بِبِلاَدِ الأعَاجِم وَصَنَعَ نَيروزَهم وِمِهرَجَانِهم وَتَشَبَه بِهِم حَتَي يَموتَ وَهوَ كَذَالِكَ حشِرَمَعَهم يَومَ القِيَامَة [75]

**واتە : هەر كەسێك لە وڵاتی عەجەمەكان نیشتەجێ بوو " یان بۆ وڵاتی عەجەمەكان ڕۆیشت " و بەژداری نەورۆز و میهرەجانیان كرد " یان خواردنی درووستكرد بەهۆی ئەم دوو بۆنەوە "و خۆی چواند بەوانەوە تا دەمرێت لەسەر ئەمە بەردەوام بێت ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەوان حەشری دەكات .**

**چوارەم : ئیمامی علی جەژنی نەورۆزی پێ باش نەبووە,تەنانەت نەیویستووە ناویشی بێنێت,**

**موحەمەدی كوڕی سیرین دەفەرموێت :** أتِيَ عَلِي رَضَيَ الله عَنه بِهَدِيَة النَيروز فَقَال : مَاهَذه؟ قَالوا : يَاأمير المؤمِنين هَذَا يَوم النَيروز.فَقَال : فَاصنَعوا كلَ يَوم فَيروز.قَال أَبو أسامة" حماد بن أسامة الراوي " كَرِهَ أن يَقول : نَيروز [76]

**واتە : ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لەسەر,دیاریەكی نەورۆزی بۆ هات,فەرمووی : ئەمە چی ؟ فەرموویان : ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە ڕۆژی نەورۆزە,فەرمووی : درووست بكەن هەموو ڕۆژێكیش بگێڕن بە فەیرۆز,ڕاویەكە ئەبو ئوسامە فەرمووی : نەیویست و پێی ناخۆش بوو بڵێت : نەورۆز**

---

(74) أخرجه البيهقي بسند صحيح في السنن الكبري برقم : 18641

(75) أخرجه البيهقي بسند صحيح في السنن الكبري برقم : 18642

(76) أخرجه البيهقي بسند صحيح في السنن الكبري برقم : 18644

لەسەر ئەم کارەی ئیمام علی کە دیاریەکەی وەرگرتووە بۆچوونێك هەیە ئەویش :

بۆچی ئیمامی علی ئەم دیاریەی وەرگرتووە؟یان بۆچی فەرموویەتی درووست بکەن,وە هەموو ڕۆژێکیش بکەن بە فەیرۆز؟

دیارە یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز لە لای ئیمامی علی درووستە,کەواتە : جەژنی نەورۆز دەچێتە بازنەی " موباحات" هەروەها لە پێناسەی موباحیش هاتووە,لەلایان زانایانی ئوصولی : بکەری کاری موباح نە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت,وە نەسزاش لەسەری وەردەگرێت .

هەروەها بنچینەیەکی ئوصولێش هەیە دەفەرموویت : " الأصل في الأشياء الاباحة الا ما حظره الشرع"واتە : شتەکان لە بنچینە و بنەڕەتدا ڕەوانە,مەگەر شتێك شەرع قەدەغەی کردووە .

سەبارەت بەم گومانە لە وەڵامدا دەڵێین : هەروەك دەزانن ئیمامی علی لەسەردەمی خیلافەتدا لە عێراق نیشتەجێ بووە,بێگومان عێراقیش دراوسێی فارسەکان بووە,دیارە پیاوێك ئەم دیاریەی لە ڕۆژی نەورۆزدا پێشکەش دەکات,کە ئیمامی علی لێی دەپێچێتەوە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە بەبۆنەی ئەم ڕۆژە ئەو دیاریەی پێشکەش کردووە,ئەویش فەرمووی : درووست بکەن,هەموو ڕۆژێکیش بگێڕن بە فەیرۆز,بۆ ئەوە بووە کە موخالفەی ئەو ڕۆژە بکات و ئەم پیاوەش فێربکات کە هەموو ڕۆژێك دیاری ببەخشێ و تایبەتی نەکات بەم ڕۆژە,بەڵکو بیکاتە ڕۆژێکی ئاسایی و گەورەی نەکات واتاکەشی وایە : ئەوان دیاری پێشکەش دەکەن تەنها لە ڕۆژێکی دیاری کراودا,ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەموو ڕۆژێك خواردن درووست بکەن بیکەنە دیاری.

هەروەها ئیمامی علی ڕازی نەبووە تەنانەت ناویشی بێنێت,بەڵکو ناوەکە دەگۆڕێت بە فەیرۆز.

هەروەها نەورۆز زۆر باو بووە لە عێراق,خەڵکی عێراق و دەوروبەری زۆربەیان لەگەڵ ئازادکردنی خاکەکەی هاتوونە ناو ئیسلام,کەوابوو : زۆربەیان ئیسلامەتیەکەیان تازە بووە,بۆیە ئیمامی علی نەیتوانیوە هەموو شتێك بەیەکەوە ڕابگەینێت,بەڵکو ویستویەتی وردە وردە تێیان بگەیێنێت,ئەمەش ئەوپەڕی حیکمەت و کارزانیە لەبابی دەعوە و بانگەوازیدا,لەوانەیە وەرگرتنی ئەو دیاریەش هەرلەبابی دەعوە و بانگەوازی بێت,دیارە نەیویستووە پەلەی لەسەر ئەم پیاوە بکات,لە تێگویاندنی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ,بەڵام لەهەمان

کاتدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە وتەی ئیمامی علی دەرکەوتووە کە پێی خۆش نەبووە و ڕازی نەبووە بەژداری ڕۆژی نەورۆز بکات,الله اعلم

سەبارەت بەوەی جەژن دەچێتە بازنەی موباح,ئەوە ڕاست نییە بەڵکو دەچێتە بازنەی عیبادەت,بی پێی ئەم بەڵگانە :

یەکەم : بۆچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵکی مەدینەش دوو ڕۆژیان هەبوو کە یاری و خۆشیان تێدا دەگێڕا,ئەویش فەرمووی " بەڕاستی خوای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕین بەچاکتر لەم دووانە : کە ئەوانیش ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان ؟ "

باشە بۆچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,ووشەی "ابدل"ی بەکار هێناوە؟کە فەرمانی ڕابردووی سادەیە,بە واتای " گۆڕین" دێت .

ئەگەر ئەم دوو بۆنەیە خەڵکی مەدینە تیایدا خۆشی و یاریان تیایدا دەکرد شتێکی ڕەوا و ڕێپێدراو بوایە نەیدەفەرموو : ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕین چاکتر لەم دووانە کە ئەوانیش : ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزانە .

یان ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,ئەم فەرموودەی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم,بەبەرهەڵستی کردن لەم دوو ڕۆژەیە نەزانیایە,بۆچی وازیان دەهێنا لەم دوو ڕۆژەیە کە لەسەردەمی نەفامی دەیان گێڕا ؟

بێگومان یەکێك لە دوو ڕۆژە نەورۆز بووە .

جا ئەگەر جەژن لە بازنەی موباح بوایە,نە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,ئەم فەرموودەی دەفەرموو,وە نە هاوەڵانیش وازیان لەم دوو ڕۆژە دەهێنا .

دووهەم : بۆچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم,فەرموویە ئەو پیاوەی کە نەزری کردبوو وشترێك لە "بوانە" سەرببڕێت,"هل کان فیها عید من اعیادهم" واتە : ئایا لەو شوێنەدا هیچ جەژنێك لە جەژنەکانی سەردەمی نەفامی تیایدا گێڕاوە؟",پاش ئەوەی فەرموویان : هیچ جەژنێك لە جەژنەکانی سەردەمی نەفامی تیایدا نەگێڕاوە,ئینجا فەرمووی :"دەی وەفا بنوێنە بەرامبەر نەزرەکەت و بەجێی بهێنە,چونکە بەڕاستی وەفا نواندن نییە,بۆ نەزرێك کە سەرپێچی خوای تێدا بێت,یاخود لە شتێك کە بەنی ئادەم نەتوانێت بیکات"

**ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت,کە ئەنجامدانی نەزر عیبادەتە,وە دەبێت ئیلا لە شوێنێك ئەنجام بدرێت,کە مەعصیەت و گوناهی تێدا ئەنجام نەدرابێت,واتە : ئەگەر تاوانی تێدا ئەنجامدرا ئەوە درووست نیە نەزر لەو شوێنەدا .**

**کەوابوو : یەکێك لەم بەربەستانە چ شتێك بوو لە ئەنجامدانی نەزری ئەم پیاوە,بێگومان بریتی بوو لە گێڕانی جەژنی سەردەمی نەفامی .**

**دیارە جەژن لە بازنەی پەرستشدایە,و ناچێتە بازنەی موباحات بۆیە کراوەتەوە بەربەست لەم فەرموودەیە .**

**کەواتە : لەم بابەتە ئەو بنچینە ئصولیە بەکاردێت,کە دەفەرموویت :"الاصل في العبادات المنع الا بدليل",واتە : عیبادەتەکان لە بنچینە و بنەڕەتدا قەدەغەکراون,مەگەر بەپێی بەڵگە بێ .**

**پێنجەم : پێشەوا ئیبن قەیم دەفەرموویت :** ولا يجوز للمسلمين حضور أعياد المشركين باتفاق أهل العلم الذين هم أهله,وقد صرح به الفقهاء,من أتباع المذاهب الأربعة في كتبهم (77)

**واتە : درووست نییە بۆ موسڵمانان ئامادەی جەژن و بۆنەی موشریکان ببن,بە ئیتفاقی زانایان,ئەوانەی کە خاوەنی زانستن,وە بێگومان شەرع زانەکانی هەر چوار مەزهەبیش لە کتێبەکانیان بە ڕاشکاوی باسیانکردووە .**

(77) أحكام أهل الذمة ج1 ص723_724

**لای مەزهەبەکان :**

**یەکەم : حەنەفیەکان**

**حەنەفیەکان لە گێڕانی جەژنی نەورۆز یان بەژداریکردنی یان دیاری بەخشین یان یارمەتی دانیان یان بەدیار خستنی ئاسەوارێك بەبۆنەی ئەم ڕۆژە,پێیان نادرووستە بەڵکو ئەگەر بکەرەکە بەگەورەی بزانێت پێیان کوفرە .**

**حەنەفیەکان لەم بابەتە لەهەموو مەزهەبەکان توندترن,چونکە ئەو مەزهەبە زیاتر لەو ناوچانە باڵادەستە و شوێنکەوتەی زۆرە کە جەژنی نەورۆز تیایدا دەگێڕدرێت,دیارە ئەوان باشتر لە مەزهەبەکانی تر شارەزان,دەزانن ئەم جەژنە جەژنی مەجوسیەکانە وە جەژنی کافرانە لە بنەڕەتدا,بۆیە ئەوەندە لەسەری توندن,هەروەها بەچاوی خۆیان دەبینن کەچ بێ شەرعی و فەسادێك لەم ڕۆژە ئەنجام دەدرێت .**

★_ **باوکی حەفصی کەبیری حەنەفی,دەفەرموویت :** لو أن رجلا عَبَدَالله تعالي خمسين سنة ثم جاء يوم النيروز وأهدي الي بعض المشركين بيضة يريد تعظيم ذالك اليوم فقد كفر وحبط عمله [78]

**واتە : ئەگەر پیاوێك پەنجا ساڵ عیبادەتی خوای گەورەی کرد,پاشان ڕۆژی نەورۆز هات و هێلکەیەکی بەدیاری پێشکەش کرد بە هەندێك لەو موشریکەکان مەبەستی گەورە کردنی ئەو ڕۆژە بێت,ئەوە بەڕاستی کوفری کردووە و کارەکانیشی هەڵوەشاوەتەوە .**

(78) الفاظ الکفر لبدرالرشيد الحنفي ص113,والبحر الرائق شرح كنزالدقائق للعلامة ابن نجيم ج8 ص555

★_ **له " الفتاوى الصغرى" هاتووه :**

"من اشتري يوم النيروز شيئا لم يكن يشتريه قبل ذالك وأراد به تعظيم النيروز كفر"(79)

**واته :هەركەسێك له ڕۆژی نەورۆزدا شێکی کڕی لە پێش ئەو ڕۆژەدا نەیکڕی بووبێت,مەبەستیشی پێی گەورەکردنی نەورۆز بێت ئەوە کوفری کردووە**

## دووهەم : مالیکیەکان

★_ **ئیبن تورکمانی دەفەرمووێت : یەکێك له هاوەڵانی ئیمام مالك فەرموویەتی :** من كَسَرَ يوم النيروز بَطِيخة فكأنما ذَبَحَ خنزيرا (80)

**واته : هەرکەسێك له ڕۆژی نەورۆزدا شووتیەك بەم بۆنەوە بشکێنێ هەروەك ئەوە وایە بەرازێکی سەربڕیبێ**

.

(79) الفاظ الكفر لبدر الرشيد الحنفي ص112,والبحر الرائق شرح كنز الدقائق للعلامة ابن نجيم ج8 ص555
(80) اللمع في الحوادث والبدع ج1 ص492

**سێهەم : شافعیەکان**

★_**ئیمامی بەیهەقی ناوی لە یەکێك لە دەروازەی پەرتووکەکەی** ﷺ السنن الكبري ج9 ص234]: "باب كراهية الدخول علي أهل الذمة في كنائسهم,والتشبه بهم يوم نيروزهم و مهرجانهم "

**واتە : دەروازەی کەڕاهەتی چوونە لای ئەهلی زیممە لە کەنیسەکانیان,و خۆچواندن پێیانەوە لە ڕۆژی نەورۆز و میهرەجانیان .**

★_**پێشەوا دەمیری شافعی دەفەرمووێت :** يعزز مَن وَافَقَ الكفار في أعيادهم (81)

**واتە : تەمبێ دەکرێت کەسێك موافقەی کافران بکات لە جەژنەکانیان .**

(81) النجم الوهاج في شرح المنهاج للعلامة الدميري ج9 ص244,وكذا قال الشربيني في مغني المحتاج

★_ **هەروەها ئیمامی لالکائی (**أبو القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور الطبري**) كە فەقیهێكی مەزهەبی شافعیە دەفەرمووێت :** ولایجوز للمسلمین أن یحضروا أعیادهم,لأنهم علي منكلر وزور,واذا خالط أهل المعروف أهل المنكر بغیر الانكار علیهم كانوا كالراضین به,المؤثرین له فنخشي من نزول سخط الله علي جماعتهم,فیعم الجمیع,نعوذ بالله من سخطه (82)

**واتە : درووست نییە بۆ موسڵمانان ئامادەی جەژنەكانی كافران بێت,لەبەر ئەوەی ئەوان لەسەر درۆ و خراپە و بوختانن,و ئەگەر خەڵكی باش تێكەڵ بە خەڵكی خراپ بوو,بەبێ ئەوەی ئینكاریان بكەن ئەوە وەك ئەوە وایە ڕازی بوونە پێی,كاریگەرن بۆی,بەو هۆیەوە دەترسین لە دابەزینی توڕەیی خوا بەسەر كۆمەڵگەیانەوە,جا گشتیان بگرێتەوە,داوای خۆ پارێزی دەكەین,بە خوای گەورە لە توڕەیی ئەو.**

(82) أحكام الذمة لابن قیم,ج1 ص156

**چوارەم : حەنبەلیەکان**

**باوکی حاریس دەگێڕتەوە لە چێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە فەرموویەتی :** ماحب لرجل أن يتعمد الحلواء واللحم لمكان النيروز,لأنه من زي الأعاجم,الا أن يوافق ذالك وقتا كان يفعل هذا فيه(83)

**واتە : پێم خۆش نییە پیاوێك بە ئەنقەست شیرنەمەنی و گۆشت بگێڕی لەبەرگەورەیی نەورۆز,چونکە لە شێوە و سیمای عەجەمەکانە,تەنها ئەگەر ڕۆژی نەورۆز ڕێککەوێت لەگەڵ کاتێك کە پێشتر ئەم کارەی تیایدا کردبوو .**

★_**قازی ئەبو یەعلا لەدوای ئەم وتەی ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت :** انما جاز ذالك,لأنه انما منع من فضل النفقة يوم النيروز,لئلا يؤذي الي تعظم ذالك اليوم,واذا وافق عادة,فلم يوجد ذالك,فهذا جاز(84)

**واتە : بەڕاستی درووستە لەو ڕۆژە ئەو کارە بکات کە موافقەی ڕۆژی نەورۆز دەکات,چونکە هەر تەنها قەدەغەکرابوو لە فەزڵی بەخشینەکەی لە ڕۆژی نەورۆزدا,هەتا سەرنەکێشێ بۆ گەورەکردنی ئەو ڕۆژە,بەڵام ئەگەر ڕێککەوت لەگەڵ عادەتی خۆی,بە گەورە دانانی تیایدا نەبوو,بۆیە درووستە .**

---

(83) الفروع الابن المفلح ج8 ص374

(84) الفروع الابن المفلح ج8 ص374_375

★_ **پێشەوا ئیبن قودامەی مەقدسی دەفەرمووێت :** ویكره افراد يوم النيروز ويوم المهرجان بالصوم,لأنهما يومان يعظمهما الكفار,فيكون تخصيصهما بالصيام دون غيرهما موافقة لهم في تعظيمهما (85)

**واتە : مەكرۆهە بە ڕۆژی بوون بە تەنها لە ڕۆژی نەورۆز و ڕۆژی میهرەجان,چونكە ئەو دوو ڕۆژە كافرەكان بە گەورەیان گێڕاوە,جا تایبەت كردنی بە بەڕۆژی بوونی ئەم دوو ڕۆژە,ئەوە موافقە كردنە بەوانەوە لەبەر گەورەدانانی ئەم دوو ڕۆژە**

★_ **هیشام دەگێڕێتەوە :** سئل الحسن عن صوم يوم النيروز فقال : مالكم والنيروز ولا تلتفتوا اليه فانما هو للعجم (86)

**واتە : پرسیاركرا لە پێشەوا حەسەنی بەسری لە بارەی بەڕۆژووبونی ڕۆژی نەورۆز,ئەویش فەرمووی : ئەوە چیتانە لەگەڵ نەورۆز,ڕووی تێمەكەن و ئلوڕی لێ مەدەنەوە چونكە بەڕاستی نەورۆز هی عەجەمە .**

**سەردەمی ئیمامی حەسەن دیارە عەجەمەكان هەر بە غەیرە موسڵمان ناسراو بوونە,بۆیە دەفەرمووێت : هی عەجەمە.واتە : هی ئێوەی موسڵمان نیە**

(85) المغني ج3 ص106

(86)أخرجه ابن شيبة في مصنفة ص67

**له كۆتايدا دەڵێم :**

**پەروەردگارا شايەد بە,من گەياندم,ئەركى سەرشانى خۆم سوك كرد و ڕاستەقينەيەكم چرپاند بە گوێى ئەم خەڵكە داماوە,هەر شتێكم نووسيبێت,لە دڵ و جەرگێكى سوتاوە بۆ ئەم ميللەتە فێڵ لێكراوە,داواكارم لە پەروەردگار ئەم نوسينە كورتەم لێ وەرگرێت و بيخاتە تێشووى دوارۆژم,وە من و سەرجەم خوشكان و برايانى يەك خوا پەرستم,بپارێزێ لە بەڵاو موسيبەتى دونيا' وە لە شاڵاوى شوبوهات و شەهەوات.....واخر**

براى موحتاجتان بە نزاى خێر

**هاوكار كوردى**

ڕێكەوتى 13 _ 6 جەمادى ئاخير ساڵى :1439 كۆچى

بەرامبەر بە : 1_3_ئايارى ساڵى : 2018

گرنگترین کتێب کە سوودم لێ وەرگرتبێ

کتێبی

# تشبه الخسيس بأهل الخميس

# فی رد تشبه بالمشركين

له نووسینی

ئیمامی زەهەبی

